وەزارەتی ڕۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
زنجیرە (٤٩٦)

# دیوانی جەمیل ڕەنجبەر

ئامادەکردنی
**جەوهەر کرمانج**

پێشەکی
**دکتۆر مارف خەزنەدار**

سلێمانی ٢٠٠٧

# دیوانی جەمیل ڕەنجبەر

* ئامادەکردنی: جەوهەر کرمانج

*بابەت: دیوانی شیعر

* تایپ: پەیام ئەحمەد

* نەخشەسازی: مەهدی ئەحمەد

* نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

* چاپ: چاپخانەی ڕوون

* سەرپەرشتیاری چاپ: کەنعان خەلیل

* تیراژ: (٥٠٠) دانە

* ژمارەی سپاردن: (٤٥٦)ی ساڵی ٢٠٠٧ی وەزارەتی ڕۆشنبیریی پێدراوە



ناونیشان

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

سلێمانی- گردی ئەندازیاران: ١٠٥ کۆڵانی: ٣٤ ژمارەی خانوو: ١٠

ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

# پێشەکی

دکتۆر مارف خەزنەدار

-١-

لەوماوەیەی جەمیل رەنجبەرم ناسی، لەمێژ نەبوو دەستی بەخوێندن کردبوو لەخانەی مامۆستایانی هەولێر، من وەکو دڵخوازێکم هەمیشە لەشاعیر دەگەڕام، ئارەزووی ئەوەم دەکرد شاعیرێکی تازەو گوم ناو بدۆزمەوە، لەو سەردەمەدا (١٩٦٩ – ١٩٧١) جەمیل رەنجبەر شەش حەوت ساڵ بوو خووی بەشیعر نووسینەوە گرتبوو، رەنگ هەبوو لەهەموو شتێکدا قسە لەڕوو بووبێ تەنیا لەشیعریش لەم لایەنەوە رووی شەرمی لەلای من دواند. بێگومان مەقامی شیعر ئەوەندە بەرزە بۆ شاعیری گەورەش نەهاتووە چاو لە رووی شارەزای شیعر زەق بکاتەوە.

لەهەموو گەشتێکی هەولێرم لەماوەیەی جەمیل رەنجبەر لەخانەی قوتابیان دەیخوێند چاووم پێی دەکەوت. زیاتر ئارەزووی ئەوەی دەکرد باسی ئەدەبی رووسی بۆ بکەم. بەتەنگ ئەوەوە بوو ئایا خوێنەری رووسیا (سۆڤیەتی ئەو سەردەمە) چێژ لەو شیعرە ریالیزمیانەی دەرەوەی وڵاتی خۆیان وەردەگرن؟ ئایا ئەو شیعرە لەبەرزیی هونەریدا وەکو شیعری خۆیان دێتە بەر چاویان؟ وەکو بڵێی، شاعر دەگەڕێ لەکۆمەڵی سۆسیالیستیدا نەژی نەتوانێ شیعری هەناسە ریالیزمی بڵێ! من هەر لەو سەردەمە سەرەتاییەی ژیانی شیعری، لەپاش تەواوکردنی خوێندنی خانەی مامۆستایان ئیتر چاوم بەجەمیل نەکەوتەوە. بۆ دواجار یەکتری بینینمان لە ساڵی ١٩٧٢ بوو، لەپاشانا وتیان لەمێرگەسوور بەماموستای خوێندنی سەرەتایی دامەزراوە.

تا ئەم داوایییەش هەڵوێستم لەقاڵبدا نەمەیی بوو لەبابەت سەرجەم شیعرەکانی جەمیل رەنجبەرەوە، چونکە بەسەریەکەوە شارەزاییم تیایاندا پەیدا نەکردبوو، لەکاتی خوێدا پچڕ پچڕ تاکە تاکە شیعرەکانم خوێندبوونەوە، بەڵام نەگەیشتبوومە رادەیێك بتوانم بڕیار لەسەر جەمیل رەنجبەر بدەم وەکو شاعیرێك.

لەم چەندانەی رابردوودا، ئەو لایەنەی چاپکردنی کۆمەڵە شیعری ئەم شاعیرەی خستۆتە ئەستۆ رووی ریزی لێکردم بۆ ئەوەی چەند وشەیێك بەبالای شیعرەکاندا ببڕم. بەمجۆرە لەنزیکەوە توانیم ئەنجامێك وەدەست بێنمو لەخۆم راببینم ئەو قسانەی لێرەدا کراوە بیانکەم.

-٢-

گەشت بەناو گوڵزاری ئەم کۆمەڵە شیعرە ساتێکی گیان یە، پیاو خۆی لەبەهەشتدا دەبینێ، بەڵام یادی دۆزەخ دەکاتەوە. لەدواییدا ئەو دۆزەخە دەبێ ون بێ! لەگێتیی ئێمەدا بەهەشت بەبێ دۆزەخ چنگ ناکەوێ.

جەمیل رەنجبەر وەکو شاعیرێك هەستی بەوە کردووە شیعری بۆ دێ، کە خستوویەتییە سەر کاغەز بەدڵی بووە، لەمەدا لەبەشێکی زۆر لەشیعرەکانیدا بەهەڵە نەچووە، بەڵگەی باوەڕ بەخۆکردن، یاتێگەیشتن لەو بەرهەمەی بەوێنەی دانپیانانێك دەیداتە خوێنەران لەدوا کۆپلەی قەسیدەی (شیعر بەبووك دەبەن)دا بەدی دەکرێ:

ئەمرۆ هەندێ وشەم خۆشویست

شیعرێکی شۆخم لێچنی

پیتەکانم هەڵگیرساندو

ئاواتێکم خستە بنی..

ئەو وشانەی شاعیر خۆشی ویستوون ئەوانەن مانای تازەی تیایاندا دۆزیوەتەوە، ئەگینا ئەگەر بۆ مانای ئەوو وشانە لە فەرهەنگدا بگەڕێ مانایێکی دەست دەکەوێ بەکەڵکی شیعر نایە.

ریتم لای شاعیر لەنگەری سووکی ئاوازی شیعری میللی (فۆلکلۆر)ی پاراستووە، چونکە بناغەی وشەو رستەو تەعبیر بەپێی دەستلەملانێی دەنگەکان (هارمۆنیا) بەڕێوەدەچێ. کێش رەوان و قافیە سوارە، لەشیعری (پێکەنینێك لەباوەشی گریانا) دەڵێ:

چاوێکی تیژ، لەژێر چاویلکەی بەردەسێل

بیر بەنینۆک هەڵدەکەنێ

بەقاندرمەی قەڵاتی کورد هەڵدەگەڕێ

لەراپۆرتی ئارەق رێژێکا نووسرا بوو

هەرچی بڵێم تەمی هەوا دەیقۆستەوە

تەرازووی شەو بەدوامەوە

خۆی دەکێشێ..

قەڵاتی کورد دروشمی (ئازادی کورد)ە. لەبەرئەوەی کورد ئازادی نەدیوە، دەبێ بەخەیاڵ ئەو قەڵاتە دروست بکا. لەقەڵاتەکەدا چی نهێنییەك

هەیە؟ نایزانێ! خۆ دەبێ بیر لەوەش بکەینەوە، هیچی تێدا نییە.کەوابێ ئەگەر بگاتە ناوی پێویست بەکەلوپەل‌و ناومالّی وەشاوە بیرازێنێتەوە. لەو رۆژگارەدا، لەسالّی ١٩٧٢ شاعیر لەرەشبینیدا دەتلابەوە، چونکە سالّی ١٩٧٠ (١١ی ئازار) خۆی نەکرد بە سالّی گەیشتن بۆ سەر (قەلاّتی کورد) بۆیە (چوونە ناو قەلاّت) بێئەنجام بوو. لەپاش سالێکیتر یا دوو سالّ (١٩٧٥) قەلاّتەکە تالاّن کرایەوە.

-٣-

رەنگە بەئاسانی بتوانین هەندێ لەلاپەرەکانی ئەم کۆمەلّە شیعرە هەلّدەینەوە بەسوکی بەسەریاندا تێپەرین، بەلاّم ناتوانین وەستانێك لەگەلّ شیعری (مردن لەگۆری سەرشۆری دەژیت) نەکەین.

لەم شیعرەدا شاعیر لایەنگری ئەو باوەرەیە (مردن لەپێناوی ژیان) واتە کۆمەلێك خەلّك گیانیان دەبەخشن لەپێناوی ئەوەی کۆمەلێکیتر یا نەوەی داهاتوو سەربەست‌و بەختیار بژین. ئەمە لەخۆ بووردن‌و قوربانی تێدایە، مرۆڤ جارێك دەمرێ، گەل نەمرە، شاعیر لەگەلّ ئەوەیە، بۆ ئەم مەبەستە (تاك) دەبێ گیانی ببەخشێ چونکە سیفەتی مردن‌و لەناوچوونی تێدایە، لە پێناوی گەل، نەوەی نەمری‌و هەمیشە زیندوویی تێدایە، ئەم تێۆرییەی خستە پراکتیکەوە لەژیانی شاعیر خۆیدا، لەکاتێکدا ژیانی لەدەستدا کە تفەنگ بەشانییەوە بوو، لەئازادی دەگەرا بۆ میللەتەکەی. گەلی ژێر دەست بۆ ئازادی دەگەرێ، گەلی برسیش بۆ نان، دەبێ (تاك) قوربانی بۆ ئازادی‌و نان بدا.

شاعیر وێلّی ئازادییە. بەشوێنیدا دەگەرێ، کۆلّ نادا، ئەوەتا لە شیعری (کێ لەسەربەرزی بەتەمەنترە لەسەرەتاکەیدا دەلّێ:

گوڵی خۆزگە

چۆن بۆ چڵی داری ژیانی دەگەڕێ

یاچۆن سەعات قورمیشی خۆی لێ وون بووە

ئارەقەی دواکەوتن دەسڕێ

گیانە منیش وێڵی چاوتم

سەد ئەوەندە لێت دەگەڕێم..

لەدواییشدا دەڵێ:

ئەرێ گیانە

ئیتر نامەم بۆ مەنێرە

پوولی پۆستە نامەکانم دەپشکنێ

سندووقی سوور

گوڕی مردن، بۆ وشەی جوان هەڵدەکەنێ

ئیتر نامەم بۆ مەنێرە

بەڕێگەی کۆن بۆم مەنێرە

تا دێمە لات، یا تۆ بەخۆت دێیتە ئێرە.

شاعیر دۆش داماوە، سەری لێشێواوە (ئازادی) لێبووە بەئەفسانە! هەموو جۆرە بەرنامەو پیلانێکی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو (ئازادی)یە. وەکو بڵێی رێگەو پیلانیتر نەماوە بۆ ئەم ئامانجە بەکاربهێنرێ، مەبەستی شاعیر جۆرو شێوەی دیبلۆماسییەت و پۆلیتیکێکی کلاسیکییە کەتا (١٩٧٣/٨/٢) -رۆژی دانانی شیعرەکە- بەکارهێنراوە بۆ گەیشتن بە

(ئازادی). ئەوەی لەدێڕی (بەڕێگەی کۆن بۆم مەنێرە) دەربڕیوە. لەپاش ئەوە دیسانەوە شاعیرانە سەری لێشێواوە، چونکە نازانێ خۆی دەگاتە ئەم ئازادییە! یا ئازادی دێتە لای. رەنگە ئەمە نموونەی دوا رۆژبینی بێ لای شاعیر. ئەوەتا ئێستا هەموو بەڵگەیێك ئەوە دەگەیەنێ ئێمە بۆمان نەکرا بگەینە ئازادی بەڵام لەوە دڵنیاین پۆلۆتیکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی (دەستەی نەتەوە یەککگرتووەکان UN) دەورێکی بالای دەبێ لەدوا رۆژدا لەهێنانی ئازادی بۆ خاکی ئێمەش.

شاعیر لەئازادی بەولاوە شتیتر نابینێ، یاخود بەلای ئەوەوە ئازادی لەهەموو شتێکیتر گرنگترە، لەشیعری (پیرێکی بەندکراو)دا، مامە پیرە، مامە سوارەیە، بەڵگەی (کوڕی ئازا)ی کوردە. هەرچەندە کوڕی ئازا ناگیرێ، بەند ناکرێ، ئەگەر بەرێکەوت بەدیلیش بگیرێ. زوو کۆت دەشکێنێ و پێوەند دەپچڕێنێ و خۆی ئازاد دەکا. ئەویش وێڵی ئازادییە، لەپشت چیای قاف، لەنزیك ئەشکەوتی کانیاوی ناوی ژیانیش بێ. دەبێ (ئازادی) بدۆزێتەوە. شاعیر ئازادی لەگوارەی نازەنین و نیگارو شۆڕە کچاندا دەبینێ:

مامە سوارە

منالەکان، چاوەڕێتن، لەو بنارە

رۆ رۆیانە، دەگریەن بۆ جووتێ گوارە

بۆ دەستگیرانی دێرینیش، کوانێ گوارە

مامە سوارە، کوانێ گوارە

کوانێ گواره

بینه گواره..

جارێ گواره نییه، بەڵام جوانان بەبێ گوارەش دەژین.

-٤-

دوورکەوتنەوەی قوتابیان لەمامۆستا کارەساتێکی جەرگ بڕو تەپینی دەروونە بۆی، یەکێ لەشیعرە پڕ سۆزو گیانییەکانی شاعیر (برووسکەیێك لەدڵەوە)یە.

شاعر مامۆستابووە، زوو زوو دەبوو بەمیوانی گرتووخانەو بەندیخانەو ناو ئەو شاخانەی نەدەکەوتنە بەرچاوی نەیار. لەقوتابیان دوور دەکەوتەوە، دوورکەوتنەوە پچڕانی رەگو دەماری ژیانە بۆ ئەو مامۆستایەی قوتابیی خۆی خۆشبوێ و بەبێ ئەو هەڵنەکا.

جەمیل رەنجبەر هەستو نەستی ناسکی دەڕژێنێتە سەر تەلی کەمانجە. ئاوازی نەمر دەخزێ تا هەموو (هەبوون، گەردوون) دەگرێتەوە. بەڵێ شاعیر بەلەش لەشاگردەکانی دوورە، بەڵام بەگیان لەگەڵیاندایە کە بەم جۆرە قسەیان لەگەڵدا دەکات:

لەگەڵتانم

شاگردەکان، دوورنیم لێتان

نزیکتانم

توخمی شیلەی گوڵە گەنمی فەریکتانم

لەناو جانتای کتێبتانا

دەرسی شیکاری شەوتانم

نزیکتانم، کاوەی نەورۆزی خەوتانم

لەگەڵتانم، لەهاتوچۆی قوتابخانە

دڵم لەناو دڵتانایە

پەپوولەی زیندانی تەمەن

لەناو باخی گوڵتانایە..

-٥-

دەبێ هەستی شاعیر چۆن گۆڕانێکی بەسەدرا هاتبێ، لەو کاتەی کۆتایی بەژیانی شەهاب و جەعفەرو ئەنوەری بەرگوێ کەوتووە؟ رەنگە ئەگەر شاعیرانە بۆی بچم، دەبێ بڵێم جەمیل رەنجبەر لەو کاتەدا خۆزگەی کردووە ئەویش یەکێك بوایە لەوان، چونکە لەگەڵیاندا هاوپیشە بوو لەگۆڕەپانی وشەو خەباتی کوردیدا، بەڵام لەشیعری (بەیادی تاڤگە سوورەکە) لەسوچێکی ترەوە تەماشای دیمەنەکە دەکا.

ئەم شیعرەی شاعر لەپاش لەسێدارەکانی قارەمانەکان نەنووسراوەتەوە، بەڵکو دوای تێپەڕبوونی ساڵێك، واتە یۆبیلی پیرۆزی ساڵێکی شایی و زەماوەندی خوێن، تاقیکردنەوەی هەستی شاعیر ساڵێکی خایاندووە، ماوەی ساڵێکی تەواو لەکەلێنێکی شاراوەی دڵ و مێشکی شاعیردا وێنەی سێ قارەمانەکە ئاوا نەبووە. تاقیکردنەوەکە شیعرێکی پڕ سۆزی داهێناوە، لەدوا کۆپلەکەیدا دەڵێ:

ئەی چاوەکان

ساڵێ رۆیی و تیشکەکانتان ئاگر دەگرن

داڵی خنکان بە تۆوی لاشەتان دەمرن

زۆر چاویتر، بۆ بارەگای ئێوە دێن و

بڕیاری سەربەرزی دەدەن

لەخاکی گڕ تێبەربوا

بەرماڵی شۆڕش رادەخەن

زۆر گیانیتر

تەرمەکانتان ماچ دەکەن و

دەبنە پردی بەرەو بەیان

لافاوی رووناکی زۆر چاو

میوانی ماڵی هەژارە، بۆ خواستنی یەک دەسگیران..

-٦-

رووداوێکی گەورەی ئەدەبی بەسەر یەکێکی وەکو جەمیل رەنجبەر بەئاسانی تێنەپەڕیوە. رووداوەکە درێژخایەنە. دەردی بێدەرمانی (یەکێتیی نووسەرانی کورد)ە، نەدەژی سوودی لێوەربگرین، نەدەمرێ رزگاریمان لێی ببێ. بەڵێ ئەم رێکخراوە لەپاش هەرەسە پشت شکێنەکەی بەهاری ١٩٧٥ەوە، لەپاش ئەو گۆڕانە بنچینەییە سۆسیۆپۆلیتیکییەی بەسەر کوردستانی عێراقدا هات، یەکێتیی نووسەرانی کورد بوو بەمەیدانی دەلاڵخانە، وشەی کوردی و دواڕۆژی کوردی تێدا مەزاد دەکرا، بێگومان جەمیل رەنجبەر لەشیعری (ئەو نووسەرانەی دەروونیان چاڵی بەفرە)، تەعبیر لەهەڵوێستی هەموو ئەو نووسەرە رەسەنانە دەکا کە خۆیان دوورە پەرێز گرت بوو لەکۆنگرەی پێنجەمی ساڵی ١٩٧٨ بەشدارییان نەدەکرد.

شاعیر لەدوا کۆپلەی شیعرەکەیدا دەڵێ:

ئەدیبەکان

دوای وشەی کۆنگرەتان

گەر چۆلەکە بۆ شازادەی پاشا نەگرن

رەوە کۆتری سەربڕاو

بەدیاری بۆ گیرفان نەبرێ

نابێ.. نابێ..

ئەگەر درۆی هەموو دنیا

بکەی بەبلوێری حیزی بلوێر ژەنێ

نانی (کانە)تان نادەنێ..

-٧-

شاعیر داهێنانی لەماناو ناوەڕۆکدا زۆرە، لەبەرئەوە لەناو ئەم کۆمەڵە شیعرەدا شیعری جوان دەکەوێتە بەرچاو. ناوی شیعر، هەموو شیعرێك رەنگە زوو لەبیربکرێ، یا پشت گوێ بخرێ، بەڵام هەندێ لەناوەکانی ئەم شیعرانە خۆیان دێرە شیعرن، یاخود پارچە شیعرێکی سەربەخۆن، لێرەدامن نامەوێ ناوی شیعری (ئەو کتێبەی وشەی بەخەنجەر نووسراوە) بکەم بەبەڵگە بۆ ئەم مەبەستە، بەڵکو ناوەڕۆکی شیعرەکە خۆی گرنگە بەلامەوە، لەسەرەتای شیعرەکەدا کە دەڵێ:

ریزە چیاکان

وەکو تەونی بەرەبەیان، راچەندرا بوون

برۆی رووناکی چاوی خۆر
وەکو ریسی مافووری دەستی قەیرە کچ
بەگولاڵەی بالاّ لاوی رایەڵ کرابوو..

مەبەستی دروستکردنی نەبستراکتێکە (تجرید) خاك لەناو سروشتدا لەقالب دەدا. دئەو خاکە بووە بەمایەی ئازارو ئەندێشە، بەلاّم ناشرین نەبووە، لەبەرئەوە هەر جوانەو خۆشەویستە، لەپاش گەشتێك لەگێتیی وردەکاری وشەو رستەو تەعبیرو مانا، ناشیرینی لەخاك دوور دەخاتەوە، جوانی دەکا بەئەدگاری هەمیشەیی ژیان کە دەڵێ:

هاتم، هاتم
ناویان لێنام بزمار کوتە
چەکوشێ بووم
ئەو دارتاشەی، ئەسکەملی ئەنجومەنی
کۆشکی سپی دروست دەکرد
ئاسنگەری کەشیشبەندی
بەندیخانەی خوێنی (باستیل)ی خەستدەکرد
هێزی منی پێنەکرا
کەوی کێوی باوەڕی پێ هەڵنەفرا..



جەمیل ئەنجبەر: شاعیرێکی ئاسكو هێمنو لەسەرخۆبوو، لەمەیدانی وشەی جوانی کوردیدا ورد لە گۆڕەپانی خەباتی چەکداری کوردایەتیدا

درشت بوو، لەگێتیی جوانکاریدا هونەروەر بوو، زمانی کوردی باش دەزانی، لەپەروەردە شارەزاو لەوانە وتنەوە سەرکەوتوو بوو، لەکۆڕی خەبات‌و جەنگدا خوێن گەرم‌و بزێوو چالاك بووە. بەهەموو جۆرێ جەمیل رەنجبەر لەهەردوو باردا، وشەی جوان‌و خەباتی چەکداری راستگۆ بووە لەگەڵ خۆی، بیروباوەڕە ناسیۆنالی‌و مرۆڤایەکییەکانی کردووە بەبەرنامەی ژیانی، نەك تەنیا بەقسە، بەڵکو بەکردەوە هەموو تێرییەکانی گواستۆتەوە مەیدانی پراکتیك.

جەمیك رەنجبەر سی‌و سێ ساڵ لەتەمەنی بەقەوارە کورت‌و کەم، بەناوەرۆك درێژو زۆر لەسەر تەختەی قوتابخانەو گۆڕەپانی جەنگاوەری‌و بەندیخانە بردۆتەسەر، یادو بیرەوەرییەکی زۆری بەجێهێشتووە، بەلام بەنرخترین میراتی ئەم کۆمەڵە شیعرەیە.

دوا مەڵبەندی ژیانی شاعیر چەك بەشانەوە، لەخەباتدابوو، لەگوندی جەلکانی پشدەرە رەقەی بناری کێوەرەش لەناوچەی سەنگەسەر. کاتژمێری سێی پاش نیوەڕۆی رۆژی ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٨٠ بوو، دوو هەلیکۆپتەری پرچەك بەدۆشکە کۆمەڵێك جەنگاوەری کوردیان گوللەباران کرد، لەئەنجامدا هەشت کەس شەهید کران، یەکێکیان جەمیل رەنجبەر بوو. کۆمەڵێکیش بریندار بوون، یەکێکیان ئەبوو بەکر خۆشناو بوو.

گیانی شەهیدی رێگەی ئازادیی کوردو کوردستان جەمیل رەنجبەری شاعر بەباڵەفڕێ خۆی گەیاندە بەهەشتی بەرین و لەگەڵ پەپوولە رەنگینەکانی کۆمەڵە شەهیدانی وشەی کوردی‌و دواڕۆژی کورد جووت بوو، بەتایبەتی لەگەڵ وەزیری نادری‌و مارف بەرزنجی‌و هیتر. لەوێ، لەدواییدا

پێشوازی لە عەبدولخالیق مەعروف و شاکیر فەتاح و دڵشاد مەریوانی و هیتر کرد.

ئەمانە هەموویان نەمرن چونکە نامرن. لەبەرئەوەی داهێنەری بەرهەمێکن ناویان لەبیرناچێتەوە، کۆن نابن، هەموو رۆژگارو نەوەیێکی کوردو ئادەمیزادی تری سەر رووی زەوی پێویستی پێیان هەیە.

هەولێر ـ مەڵبەندی رووناکی

١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٥

# لکە زەیتوون لە گێژاوی خوێنا
## خۆری راستی

لەئاوێنەی ژینی پڕتۆف
وێنەی لاویی خۆم بینیوە
لەئاواتی ئەندێشەو ئۆف
پەیکەرێکم هەڵواسیوە
لەگەرداوی چۆڵی ژینا
لەبۆشایی ئاسمانێکی ماتەمینا
داوی تەمەن دەهۆنمەوە
دەردەکەوێ راستـو روونە
پیشەی ناپاکی گەردوونە
ئەو ژیانە منی ناوێ
وا دەمخاتە گیانە لاوێ
چاوی پیسیی پێم هەڵنایە

وەک مێملی لاو. ٠

لەڕێگایە..

لەباوەشەو بەتوانایە

منیش گیانی زیندووم لایە

دارو دەستەی رابوردن نیم

وەک کوڕی رۆژ لەخواردن نیم

بۆ دوژمن ناکەم لای لایە

بەبت ناڵێم ئەوە خوایە

هەر ئەو کەسەم

پەنجەی راستی هەڵدەبڕم

سینگی دوژمن هەڵدەبڕم

دەڵێم ئەوە تیشکی خۆرە

بێگومانم زەردو سوورە

بەئاواتم بۆ کوردستان

هەڵبێ خۆری گەل سەربەستان

١٩٦٨/٩/٢٥

لەهاوکاری بڵاوکرایەوە

# شۆڕشی زەوی

ئەی خەڵکینە..
دۆڵو چیاو دەشتو زەوی
هی کەسێکە بۆی ناخەوی
هی کەسێکە خۆی دەی چێنێ
لەپێناویا ماندوو دەبێ، بەرهەم دێنێ
من جوتیارم.. لەسەرکێوی بڕوای بەتین
خۆم داوێمە باوەشی ژین
بەزبارەی، بیری جوتیاری جحێلم
زەویو خاکی باپیرانم ورد دەکێڵم.

منی جوتیار
کرێکاری برای گەورەم.. ئاگای لێمە
ئامێرم بۆ درست دەکا
بۆ کێڵان‌و دروێنەوەی سوودی ئێمە
جەرگی سروشت بست بست دەکا

منی جوتیار..
رەنجی ئەونمە ئارەقەی بۆ خۆم نەبوو
ئەمڕۆ دەیکەم. بەجۆگە بۆ کفنی مردوو
کفنی مردووی دەرەبەگ‌و پاشایدوێنێ
رەگ‌و جەستە تولخاوەکەی لەگشت شوێنێ
بەدەستاڕی دەستی مێژوو دەهەنجنم
لەجێی ئەوا، لێی دەڕۆینم، تۆوی گەنم

١٩٧٠/٧/٢٠

# گرمەی ژانی بەهارێك

ئەی خۆشەویستم
من لەتۆ ناگەم بۆ لەدایک بووی
خۆزگەم بەوساتەی
لەزستان ون بووی

خۆشەویستەکەم

بامۆسیقاکەت. شمشاڵی داس بێ

بلوێری جەفا... وێڵی پێ کاس بێ

هاژەی رووباری دڵی گەرمم بێ

گلێنەی چاوی کوورەی خەمم بێ

وشەی گۆرانیت نوێ بێ بۆ ئێستا

گەر بەبێ ترس..

قوڕت لەدەنگی گەرووی تر پەستا

گۆرانییەکەی تۆ، بێهاوتا دەبێ

گەرووی زێڕینیش بێپەنا دەبێ

ئەی ئەو بەهارەی خونچە ژان گرتوو

منیش دەمەوێ. دەمەوێ زیندوو

وشەو ئاوازی گۆرانییەکی دڕ

سازی ئازار نۆش

بێت شۆڕشم پێبکا بەخوو

ئینجا بەتێکڕا

خەڵکی کوردستان

چەندین بیرسر,, دەهێنمەوە هۆش

ئەرێ ئازیز گیان

لەدوێنێکەوە.. گوێم لەدەنگێکە

لەگەرووی ویستی کوردا دەردەچێ

پرشنگی ئاسۆش. لیخن رەنگێکە

بەتواوی بیستن..

ترسی تیا دەچێ

١٩٧٠/٩/١٥

لەژمارەی (١٦)ی هاوکاری بڵاوکرایەوە ساڵی یەکەم

## فێرگەی خۆشەویستی

ئەی دەنووک سوور
ئەی گڕی چاوی ناو سنوور
ئەگەر رۆژێ، فرمێسکی چاومان خواردەوە
نانی دەستی داگیرکەرمان هەناردەوە
گەر لەزمانی هەژار فێربووین
لەئازاری برسی تێربووین
ئەوسا باڵی ئاشتی دەردێ
رۆژی یەکسانیمان هەڵدێ

***

ئەی دەنووک سوور
ئەی گڕی چاوی ناو سنوور
کەچووین بۆ خوێندنگای بەهار
لەدارستانی سنگتا
سەربەست گریاین
لەکانی ساردی چنگتا..
بۆ ئاگری مەبەست گریاین
ئەوسا پەری ئاشتی دەردێ
ڕۆژی یەکسانیمان هەڵدێ
***
ئەی دەنووک سوور
کە ئەندامی لەشی کوژاراو.. کرایە پێت
لەسەر دێڕی وشەی تۆڵە
دیمان هەژار.. پەیامێکی نوێی بەکۆڵە
ئەوسا نامەی خۆشەویستت بۆ دەنێرم
بڕوانامەی شۆڕشگێڕیت پێ دەسپێرم
***

ئەی دەنووک سوور

ئەی گڕی چاوی ناو سنوور

وەرە هەردوو

بالە چاوی لێڵی سووری چیا بپرسین

بائەدرەسی

خۆزی دووری گەل بنووسین

لەسەر پەڕەی دڵی زیندوو

با بنووسین: یەکسانی بوو

چی هەژاری شۆڕشگێڕە ماچی تفەنگ دەکەن بوخوو

١٩٧٠/١١/٢٥

# نەورۆزی کورد

هۆنراوەی دڵ.. لەقوڵایی بیری پرسۆز

زۆر جار وترا. بۆ جەژنێکی وەکو نەورۆز

کەنیشانەی یەکەم رۆژی سەرکەوتنە

سنوورێکی پێشکەوتنە..

رۆژی رزگاریو ئازادی

لەسەردانی (زوحاکـ)ی زۆڵ، رۆژی شادی

تیایا باسی سەرکەوتنی کۆنی کورد بوو

وشەی رەنگین بۆ ئەو رۆژە دەکەوتە روو

گەل ئەو جەژنەی لەیاد نەچوو

***



٦

کوردی نەبەز گەورەو بچووک
لەگەژاوەی بەهاری بووک
لەپاڵ دۆڵو شاخی سەرکەش
بەپشکۆی گەش..
دەیان نووسی (بژی نەورۆز)
بژی یادی راپەڕینی کاوەی دڵسۆز.
***
هەمان نەورۆز
ئەمساڵیش وا یادی دەکەین زۆر شانازین.
بەڵام هیوای جەژنی تریش هەر دەخوازین
تا چەوساوەی کورد بگرێتەوە بۆ جەژنێ
دووبەرەکیو کێشەی ناوخۆ ببڕێتەوە
بۆ نەورۆزێک
وەک هی ئەمڕۆ، گشت دڵسۆزێک
بۆ یەک رێگا هەڵگرێکی تۆربەی بیرە

تۆبەری بیری کوردایەتی کوردی ژیرە

ئەوەی ژیرەو کەدڵسۆزە

لەخەباتا سووتەمەنی هەموو هۆزە

بەبێ گومان کە جوتیارە

چەوساوەیە، کرێکارە

تادوا ئامانج بەبێ کۆڵدان بەپەرۆشن

بۆ ناو نانی جەژنێکی تر تێدەکۆشن

***

تا ئەوانە دەخنکێنرێن

ریشەی نیازی ئەو پزیشکە دڵڕەشانە

دەردەهێندرێن

کە لەجیاتی چاری چاوی ئادەمیزاد

چاو هەڵکۆڵ بوون، بۆ خۆ ژیان

تاکو سپی رەنگی خۆزی بیری ئازاد

رەش بین بکەن...

ئەو خەڵکەیان خستە گومان

چاک ناسینی ئەو زۆڵانەو دۆستو دوژمن
دەسکەوتێکە یەکجار مەزن
تا کورد بڵێ بۆ یەکێتی بەپرۆشن
بۆ ناونانی جەژنێکیتر تێدەکۆشن
بەڵام، بەڵام
تاخاوەنی درۆی زلو خۆ هەڵکێشان
تەرادێنی هەر لەباوبێ
تاکو خلتی میکرۆبی نێو کانی ژیان
بۆ خواردنەوە.. لەناو ئاو بێ
هەتاوابێ.. لەیەک ناگەین
جەژنی خۆشیو لەش ساغیمان.. گومان نابەین
تاکو تەمو هەوری پێش خۆر. ئەتوێتەوە
تا چوار پارچەی دڵی خوێنین
کەرت کراوی ئەنقەست بەزۆر
یەکتر بەبیر. بەکاری نوێ نەگرێتەوە
ئاهەنگیش بێ دڵی بەهار ساردو سڕە
خۆمان برسین. چەوسێنەرمان تێرو پڕە
***

تاكليلى سەربەستيمان لاى زۆرداربێ

رزگار نابين

تا چەوسێنەر لەنێو خۆمان وەكو هاربێ

بەختيار نابين

سابا نەورۆز چراى بيرمان هەڵگيرسێنێ

دوژمن بەگەل بناسێنێ

چەوسێنەرەو چەوساوەكان جياكاتەوە

ئالأى يەكێتى دڵسۆزان هەڵكاتەوە

١٩٧١/٣/١٥

لەهاوكارى ژمارە (١٠) بەناوى (ج بێدەنگ) بلاّوكرايەوە

# هاواری کوردێکی ئێرانی،
# لەبەردەم سێدارەدا

نازانم چۆن..

ئەو گریانە بگۆڕمەوە.. بەپێکەنین

چ گریانێ؟!

بۆچ ژانێ؟!

گریەی دڵی برینێک لەمە هاباد!

کەوتە گیانی گیانی کوردی ژێر دەست

تا ئەمڕۆکە، لەسێدارەو ئازار دەژین.

*

وا دوژمنە بیرخاوەکان

لەسەر سکی چەوساوەکان

شایی دەکەن..

سەرچۆپی گر: شاهەنشایە

شوێنی سەما: کوردستانە

بەندیخانە: شێوەی رقی مرۆڤ کوژی ئەمەریکایە

شاباشەکەی: رەنجی جوتیاری گەلانە

بەدرێژی ساڵ.. پەتو گوللەو رۆڵەی ئازت

بەبێگاری.. ئیشو کاریان.. دەس لەملانە

*

هەرباوکە وەسیەت دەکا..

کچم، کورِم، گوێتان لێبێ...

من قوربانی چاوی هیوای رزگاریمە

دژی دەزگای دەرەبەگو سەرمایەدار

لەگەڵ مردن.. دڵداریمە

*

هەر ئافرەتە.. بەرۆلە رۆ:-
بۆیە مێردەکەی منیان کوشت
خوێنی هەزاران وەک رۆڵەی قازییان رشت
چونکە لەکارگەی شۆڕشا هەڵێنجرابوون
بەچکەی گیانی خوێن مژراو بوون
ئازاد خوا بوون
*
هەرجوتیارە:-
لەوتاری درۆزنەکان، تێرمان خوارد
لەنووکە نووکـو هێرژنی..
گەرووی تینووی بێهیوامان.. تێرمان خوارد
لەئازارو پەرگەندەیی.. لەلێدانا
لەفرمێسکـو خەم شیلانا.. تێرمان خوارد
لەچۆڕاوگەی خوێنینو ئارەقەی گیانا
تێرمان خوارد
*

مافی مرۆڤ.. لەکاغەزا..

درۆیەکەو هەڵواسراوە

سەر کارەکەی.. لەراست شادا، دەمکوت کراوە

لەجیاتی سەربەستی گریان

بۆ چەوساوەی گڕی سبەی ناو کوردستان

سەربەستی کۆمەڵ کوشتنە

پیاوی (قوام السلطنة)

کردەویان: هەر بەکۆمەڵ کورد گرتنە

هەر بەکۆمەڵ: خوێن رشتنە

چونکە گیانە، ئەم کردەوە

گیرفانێکە، پوولی تیایە

گیان کڕین و.. ماچ و قژی لوولی تیایە

*

خۆشەویستم

سەیر نییە ئەگەر بیستم

شەقلاوە جێی هێلی گەرمی ئیستیوایە

دارستانی تەروفێنک، وشک بووە

گەرووی جۆگەی خۆشەویستی بێ نەوایە

چونکە تەرمی بەستەلەکی دووباڵی شەو

ئالاوەتە بینی، لەشی خۆشەویستم

بەزەبری زۆر، کەوتۆتەخەو

١٩٧١/١١/١٠

# سێ گۆرانی لە رۆژێکدا

تەراخۆما.. کاتێ تیشکی چاوێ دەگرێ

لەدەم چاوا.. برژانگی سوور پەخش دەکرێ

ئاسۆی نیازی کوردی دیلیش

لەژێر تەلارێکی روخاو

تابڕکا چاو..

چاوەڕوانی خۆرهەڵاتی خەباتێکە

خەمی ئاووس.. وابەتەمای ئاواتێکە

*

دەرۆزەکەر..

لەکۆڵانا. لەشەقاما.

کاتێ نانێک داوا دەکا

بۆ پوولی. بانگی خوا دەکا

رووی ژێر دەستی گەرووی هەژار

بانگی هێزی شۆڕش دەکا

داخی تینووی شاری برسی

وشەی رزگاری دەپرسی

*

کرێکارێک..

لەمەیدانی بێکاریا

لەمەیدانی دارکاریا

توورە، توورە گیرفان بەتاڵ

کاتێ بێئیش دێتەوە ماڵ

تاو دەداتە، یەغباری رەش

وشەی شیعریش

خۆر هەڵدێنێ بۆ.. ئاسۆی گەش

زۆربەی بیرە نووسراوەکان

لەمەیدانی چەوساوەکان

یەکێ نەبوو کاری پێ بێ

یاگوێی لێبێ

بۆیە شیعری ئەمڕۆی شاعیر

دەنگی بەرزە.

لەمیکرۆفۆنی کردارا

نابێ دیل بێ..

لەناو دیواری بێزارا

**١٩٧١/٥/٢٢**

لەژمارە (١٢٨)ی هاوکاری ١٩٧٢ بڵاوکرایەوە

# وەختە لەدایک بم

دۆستەکانم، هێشتا وشەم..

سواڵکەرێکی، ژێر تەلاری دەوڵەمەندە

هێشتا وشەم بێ نان‌و ئاو

چاوەڕوانی خێری بیرە، بیری خەندە

هێشتا وشەم،

جوتیارێکی بەبێ عەردو، ماف خوراوە

لەژێر زەبری دەرەبەگا..

گیانی هەستم وەکو منالّ. بۆ خۆر دەگرین

ترساوێکی بێژەی بڤەن

لەچاویانا دەڕژێ ئەسرین

هەچەندە وایە.وشەکانم

لەباوەشی دایکی بڕوا فرچک خۆرن

**زۆر چاوتیژن..**

**وەک بڵێسەی لوولەی تفەنگ. پشکۆ سوورن**

**وشەکانم. وتەکانم. سەنگیان هەیە**

**کۆڕپەیەکی زمانزانن**

**پەروەردەی شیری گۆی مەمکی بابە گوڕی کوردستانن**

**دۆستەکانم.. نازانم**

**ئێوەش وەک من وان!**

**وشەکانم، وتەکانم**

**هی بازاڕی فرۆشتن، نین**

**لەپەروەردەی بەرەی زیندووی**

**سبەی دەدوێن.**

مایسی ١٩٧١

لەگۆڤاری قوتابخانەی باتاس بڵاوکرایەوە لە ١٩٧٢.

# کوتەکی مێژوو

(لەدەریا مەنگە کەشا هەر دەپەڕینەوە)

باوەڕی نێو چەپکی دەمار

بەئاوازی گۆرانی شار

رستی قامکە..

شەوی شوومی تێکەوتنمان

خر دەپچڕێ

داری شەپکی..

پاپۆڕەکەی سەرکەوتنمان

بەمستی گرانی چەوساوە

توند تێک دەخرێ.

پاڵەوانی شانۆکە کێ بوو؟

کاتژمێری رووداوەکان

دەچرکێنێ..

دەڕوا دەڕوا.. باوەش دەگرێتە بەڵێنێ

لەسەر شانۆی چەوسێنەرە ناسراوەکان

هەڵدەگژێتە پەیامنێری بانگی درۆ

هاوارێکی لەدایک بوو..

دەکاتە پاڵەوانێکی چەقی شانۆ

١٩٧١/٧/١٠

لەژمارە (٢)ی ساڵی ٢ی گۆڤاری هەولێر ١٩٧١ بڵاوکرایەوە لە ئەیلولا.

# بڕیارێک لەگەڕووی ئاگردا

خۆشەویستم..
سەیر نییە ئەگەر بیستم
ئاسمان بەناو عەردا تەپی
تیزابی خوێنی لێپەقژی
چونکە ئاسمانی چاوی تۆ
لێوی دیناری هەڵمژی
خۆشەویستم
سەیر نییە ئەگەر بیستم
لەجیاتی کەو، قەل دەخوێنێ
لەسەر لوتکەی گیانی من خۆی دەنوێنێ
خۆشەویستم.
سەیر نییە ئەگەر بیستم
تێرو پڕی

لەئامانجی خۆت دەخوڕی

چونکە گیانە..گیرفان لاڵە، گیرفان لاڵە

قسەم تاڵە، قسەم تاڵە

خۆشەویستم..

سەیر نییە ئەگەر بیستم

ئەو چیا بەرزەی سەفین.. چاڵە!!

سەیر نییە ئەگەر بیستم

دەمی مردوو..

لەوتنی راستی قاڵە

گیانە، گیانە..

ئەی یاری رابردووی دوێنێ

تینی دڵی خۆشەویستیت بێ خرپەیە

مەلی بەرزایی ئاواتت

بێ ئاوازو بێ چرپەیە

١٩٧١/١٢/١٨

لە (نوسەری کورد) دا بڵاوکرایەوە، ١٩٧٢

# لکە زەیتوون لەگێژاوی خوێنا

-١-

ئای بۆ وشەی زمانزانی دەروونی رۆژ

چۆن گـ

گوللە بۆ سینگی دوژمن.. وا دەتەقیٚ

ئای بۆ بیری پێشمەگەی لات

لەقەد پاڵی هەموو کێوێک

لەسەر لاشەو خوێن دەچەقیٚ

ئای بۆ دایکی گەرووی ئازار

کە بەمەمکی بابەگوڕگوڕ..

لەژێر گڕی سینگی تۆڵە

رۆڵەکانی گۆش دەکردن

زامە سارێژنەبووەکانی.. پاپیرانی

بەفرچکی رزگاری (خۆی) نۆش دەکردن

بوتوورەیی..

دەرگەم لەساڵی حەفتاو یەک بەدڵ داخست

پێچکەی ناڵەی سیمفۆنی ژین

چاوی ساڵی نوێی هەڵێنا..بەزەبری مست

دوێنێ.. پێرێ،

کۆمارێکمان لەدایک بوو بەرگتان نەکرد

کەلێیان داین..

لەپێناوی قامی دیلی، وەک پێویست بوو

دەنگتان، نەکرد

-٣-

بەتوورەیی..

پەردەی شانۆی زامی چاوم، هەڵدایەوە

قژی خۆریش..

بەهێمنی بۆسەر سینگی خۆشەویستم، رژایەوە

چونکە پێرێ..

ئارەقەی دیلیمان نەسڕی

هەر دۆشاومان بۆ بن گونی خۆمان دەكرێ

چونكە دوێنێ..

مافمان خورا.. خۆمان كڕ كرد

هەرگیرفانی خۆمان پر كرد

-٤-

دەستی خەمی..

پێشڕەوی ناو بووركانی خوێن.. بەتووڕەیی

پەتی مێژووی دوێنێو ئەمڕۆی. توند گرێدان.

گڕی ئاسۆ.

بۆ پێكانی شەوی شۆڕش والەڕێدا

چونكە تاپار.. تا ئەمڕۆكەش..

لەپردی پەیمانی چەورا. هاتین. بەغار

هیچمان نەینا.

نەبۆ برسی. نەبۆ هەژار

شیعرەکانم،خوێن و گڕن

وەک دایکێکی، کۆرپە ونبوون

بۆ پەلاماری پەیامێ.. هارودڕن

دەگوێ بگرن، لەهۆنراوە، لەشیعری نوێ

خۆ گەر شیعرم بەرتیل بوایە،گوێتان ەگرت!

دەمی بیری گیان مردووتان..

وەک پارووپەک قووتی دەدا.

ئەگەر شیعرم تۆی شەڕ بوایە.. گوێتان دەگرت

دەستی رەشی زامی دوورتان..

لەکێڵگەی برایەتی گەلا.. زوو تۆی دەدا

-ب-

ئەگەر شیعرم، قابیل بوایە بەژێر دەستی

گوێتان دەگرت

خوێن و زامی گرپە دوێنێ..

بەبار داخی پێ دەخواردن

ئەگەر شیعرم دانسی شۆخی ئاهەنگ بوایە

گوێتان دەگرت

بلیتێکی گران بایی..
سەدان دینار، زۆر قوربانی پێ دەژماردن

-ج-

ئەگەر شیعرم سامان بوایە، گوێتان دەگرت
سایلۆی نیازی چاوی برسی
خێرا دان‌و پارەو خوێنیان، هەڵدەمژی
یا گەر شیعرم دیلی زۆرداریتان بوایە
لەپردی زەبری دیوەخان
بۆ بیستنی، هەر وشەیەک
چەندین بەندەتان دەکوژی

-د-

شیعرەکان..
گۆرانییەکی بیری نوێیە
پارووی دەمی زگی، برسیی کوردی پێیە
شیعرەکانم خوێن‌و گڕن
وەک دایکێکی، کۆرپە ونبوو
بۆ پەلاماری پەیامێ.. هارد دڕن
بۆیە ئەگەر..
بڵێن ئێمە..

**بڵێن ئێمە، لەشیعرەکانت بێبەرین**

**لێتان ناگرم..**

**دەرەبەگن، بۆرجوازین**

**ترسنۆکن، بەگشت جۆرە ژینێ رازین**

**دیارە دڵتان، چاوتان، بیرتان**

**هێشتا فێری هۆنراوەم نین**

١٩٧١/١٢/٢٨

لەکۆڕێکی ئەدەبی خوێندرایەوە

بەبۆنەی یەکەم میهرەجانی شیعری کوردی لەکەرکوک نووسراوە کەچی لیژنەی میهرەجان ترسنۆکانە ماوەی خوێندنەوەی نەدا.

# بورکانیچل
# لەکێڵگەی خەما

هێشتا باوە
تەرمی ئاوزینگ نووزەی ماوە
هێڵی پەڵپی کشانەوە
چاوەڕێیە..
تاهۆلاکۆ لەگەڵ تۆردووی چەوسانەوە
لەگۆڕی نەفرەت لێکراوی هەڵسێتەوە
بەڵکو مژدەی.. وێرانکاری، ئێستای پێیە

*

هێشتا باوە
هێڵی کشانەوەی درۆ
سەر دەکاتە کەڵبەی گورگ
بەفرچکی ئەو دێتە گۆ
دەمانبا بۆ چاڵی مەرگ.

*

هێشتا باوه..

ڕێی سەدان ساڵ بەچاو نوقانێک دەبڕین

لەسەر قۆچی مانگا دەفڕین

کەس نازانێ چ بانێکەو چ هەوایە

هاوار لەوەی (هەیهو)ی نایە

*

هێشتا باوه..

چاوی کزۆڵ نووزەی ماوه

هێشتا تینوی برای برسی

کەسیان لەیەکتر ناپرسی

هێشتا کونی لوولەی تفەنگ

نەبوویتە دەرگەی نیشتمان

چەوساوەکان هەموو یەک دەنگ

ڕێک نەخراون بۆ پاڵپشتمان.

*

هێشتا باوه.. چاک دەزانم.. هێشتا باوه

چاوی کزۆڵ نووزەی ماوه

هێشتا گوللەی وتەکانمان.. هەر چرووکه

فرمێسکی شەرمی هۆنراومان

ئاوی دەمە!! نازی بووکە!!

قاچی ماندووی دیلێتیمان

فێڵ لە (دەرزی)ی سڕبوون دەکا

باڵای کۆمی پیرێتیمان

درۆ لەگەڵ هەڵچوون دەکا

*

هێشتا باوه..

تەرمی ئاوزنگ نووزەی ماوه

ئەوەی وتم: پەڵەی داوه

بەڵام هەرگیز.. لەناو کێڵگەی ئەم ماتەمە

لەگەڵ زللەو نووکی قەمە

رۆڵەکانی خەم گەورە بوون

**پیتی شەپۆر..**

**لەسەر دێڕی شیعرا ونبوون.**

**ڕەنگی چاوی وێڵی پرسە**

**چارەی ئەم بارەی لا قورسە**

**جەستەی هەڵباز، لەکۆڵدانە**

**پێچکەی تۆڵە، لەخوڵدانە**

**گرمەو سرودی ئەم جارە**

**بەئاڕاستەی پەنجەی خۆرە**

**یەکجار هارە..**

**بوومەلەرزەی ژێرەو ژوورە**

**وەک تامەزرۆی..**

**ماچی دڵداری لێکدوورە.**

١٩٧٢/١/١

لەهاوکاری ژمارە (     ) ١٩٧٢٣ بڵاوکرایەوە

# لەپێناوی
# ڕۆژێکی بێ کۆتاییدا

هۆ دایەگیان..

ئەو سەردانەی کە بۆی دەچم

یەکجار دوورە

ئاسۆی هەموو ڕۆژێکی ڕێی

بەخوێنی زۆرداران سوورە

هۆدایەگیان

چاوەڕێی دیتنەوەم مەکەن، نایێمەوە

لەسەردانی ڕێگەی ژیان

بەم زوانە نایێمەوە،

*

هۆ دایەگیان، لێم مەپرسە نایێمەوە

تاکو نەبمە ئاسنگەری داسێکی تیژ

تەبارەی ژەنگاوی پوچەڵ بەخێرایی نەدوورمەوە

کەپڕ لەئازارو ترسە

هۆدایەگیان، لێم مەپرسە

بۆ بێمەوە. بۆ بێمەوە؟

*

هۆدایەگیان..

تاجۆخینی، بیری مردووی وتەی قەڵەو

نەکەم بەخۆڵەمێشێکی بەردەم هەوا

تا زۆرلێکراوی کوردستان.. هەڵنەستێنم

لەقاوغی قرشەی خەوا

ئەم سەردانە هەرچەند بەئازاری ترسە

بەڵام دایە لێم مەپرسە، لێم مەپرسە

نایێمەوە، نایێمەوە

هۆ دایەگیان، ڕێگەم بدە
تازەندۆڵی ئازاری ژین هەڵنەدرم
تاکو دەشتی باپیرانم..
بەگاسنی جوتیاری نوێ شۆ نەبڕم
تا تۆی برسیی پێوەر نەکەم
لەنێو سنووری زەویەکەم
بەسەربەستی هاوار نەکەم
هۆ دایەگیان لێم مەپرسە
کەچی ئەرکێکی زۆر قورسە
بەڵام دایە نایێمەوە، نایێمەوە
*

هۆ دایەگیان.. ڕێگە بدە

تاکو تاجی خەمی مێژوو لەگۆڕنەنێم

تا لەگەڵ خۆر..

سرودێکی بڕوای نەمر بەدڵ نەڵێم

هۆ دایەگیان، لێم مەپرسە

خەباتێکە، کەچی بەئازارو قورسە

بەڵام دایە، نایێمەوە، نایێمەوە

*

هۆ دایەگیان.. بەجێو دێڵم

تابارەگای خاکێکی سوور

بۆ وچانی چەوساوەکان دروست نەکەم

تاتەلاری ئامانجی کورد

لەکەلەشی کوژراوەکان دروست نەکەم

هەرچەندە بەئازارو قورسە

**لێم مەپبرسە**

**نایێمەوە، نایێمەوە**

**هۆ دایەگیان.. واپێت دەڵێم**

**تاکلیپی سەربەخۆیی نەگرمە دەست**

**تاکو دەرگەی کوردستانی لەتکراومان**

**بەگوللەی هەق.. بۆ یەکسانی**

**بۆ بەختیاری.. بەرزگاری.. نەکەمەوە**

**تانەکەومە.. ناو باوەشی چاوی مەبەست**

**هۆ دایەگیان.. لێم مەپرسە**

**لێم مەپرسە..**

**نایێمەوە، نایێمەوە**

**تارزگاری هەژارەکان نەهێنم.. من نایێمەوە**

١٩٧١/١١/٢

لەژمارەی تایبەتی رۆژنامەی هاوکاری ١٩٧٢ بڵاوکرایەوە

# تیشکێ بۆسەر هەڵوێستەکان

خۆشتدەوێم

خۆشویستیت، یاسایێکە

خۆشەویستیت سنوورێکەدەبێ من تیای دەس بەسەربم

لەئازاری دڵیش نەدوێم

خۆشتدەوێم، گەر لەدەفری یاسای تۆبم

لەچوار دیواری ماڵێکا

وەک شەوی تۆ، وەک رۆژی تۆ

فریشتەی دەس لەئەژنۆ بم

خۆشتدەوێم، لەگەڵتابم

چاوی برسیت لەچاوما بێ

خۆشتدەوێم، شاعیرێ بم

گڕی وشەی خۆشەویستیت

لەقووڵایی هەناوما بێ

*

خەشتدەوێم، خۆشتدەوێم

بەڵام گیانە. لەسەر ئەوەش تۆ دەتەوێ

مەلی وتەی جوانەمەرگم

لەکودیلەی دەنگی دزا، لات بخەوێ!

تۆ دەتەوێ شاعیرێبم.. ئەوە نەبێ ناوم بێنن

دەستەی کچان، هۆنراوەکانم بدوێنن

تۆ دەتەوێ کەس نەمناسێ

نەوەک ئاخم بۆ هەڵکێشن

نەوەک نامەم بۆ بنێرن

نەوەک دیاریم بۆ بسپێرن

خۆشەویستم، تۆ دەتەوێ

سۆزی ئەندێشەی پەیکەرت بمخواتەوە

گیانی گەورەم لە بوخچەی بەستراوی چاوت

تابەیانی.. بەئەندێشە..

دەرگەی ئاسۆ بکاتەوە

خۆشەویستم..

تۆ دەتەوێ وەک شاعیرەکانی پێشوو

کەرامەتم بگۆڕمەوە، بەماچی روو

تۆ دەتەوێ، کۆڵهەڵگری نازی تۆ بم

نۆدەتەوێ.. سواڵکەری ئاوازی تۆبم

*

خۆشەویستم..

خۆشەویستیم، لەدڵۆپی فرمێسکایە

لەبرژانگ و قژی ڕەش و لەبسکایە

خۆشەویستیم.. لەگەڵ وشەی هۆنراوەما

لەنێو دەریای خرپنیتا، وا خنکایە

خۆشەویستم.. خشەویستیت، پەیمانێکە

سواری ئەسپی مێژوو بووە، لەگوێ چەمێ

گرەو لەگەڵ شەپۆل دەکا

بڕوای چاوی جیهانێکە..

هەر دەتکەمێ، هەر دەتکەمێ.

ئاداری ١٩٧٢

لەژمارە (١)ی ساڵی ٣ی گۆڤاری هەولێر بڵاوکرایەوە

# خۆشەویستییەکی گەرم

ئەی مۆمی تامەزرۆی هەستم
خۆشەویستم
تا تۆم نەدیت، تۆم خۆشنەویست
نەپێکەنین، نەگریانم نەدەزانی
تا ئاوازی وشەی خۆشەویستیم نەبیست
نەکەوتمە ناو گیانی هیوای کامەرانی

*

خۆشەویستم

ئەی مۆمی تامەزرۆی هەستم

تا تۆم نەدیت تۆم خۆشنەویست

خوڕەی رووباری دڵداریم نەهاتە هۆش

ژانی دڵم، وەکو هێزی هەڵمی خوێنین

لەئالەتی ژیانی نوێ نەهاتە جۆش

تاتۆم نەدی..

بەراوردی خۆمم نەکرد، لەگەڵ مردی

تاتۆم نەدی، بۆ خۆشی خۆر، رووناکی رووی

پێکەنینی منالأنم لەخۆم نەبیست

*

تاتۆم نەویست، خۆشەویستم

نەمدەزانی، هێلانەکەم ساردو سڕە

نەمدازانی.. باوکم دەرهەق دەستگیرانم

بۆ خوازبێنی لاتو کرە.

*

خۆشەویستم

ئەی مۆمی تامەزرۆی هەستم

ئەو خۆشەویستییەی کە هەمبوو

هەڵەتە بووی دورگەی خەم بوو

نەمدەزانی کە پێویستم بەخۆم هەیە

نەمدازانی کە پێویستم بەگەل هەیە!

پێویستمان..

بەپردی سەر جۆگەی خوێنی دەم کەل هەیە

*

نەمدەزانی.. لەبازاڕی ئاڵۆزکاوا

پێویستیمان بەتۆ هەیە

نەمدەزانی وا دوژنمی خۆشەویستیم

لەرێی سەختی ئاسۆ هەیە

*

ئەی مۆمی تامەزرۆی هەستم

تاسەودای نیازی تۆم نەبوو

لەتاریکی خەمی شەوا..

نەک هەر مەشخەڵ.. تا مۆم نەبوو

*

هەتا دووربووم لەو کاروانەی بۆ خۆر دەچوو

بۆگریانی.. ماڵوێرانی نەموت پەککوو

تا تۆم نەدی..بەراوردی خەڵکم نەکرد، لەگەڵ مردی

تا تۆم نەویست

نەمدەزانی پەرگەندەیم

نەمدەزانی.. قوربانی ئەم مەڵبەندەبم

نەمدەزانی داوای مافی ژیان بکەم

نەمدەزانی.

فرتەنەکەی (چینی میللی)و (ڤیتنام) هەڵکەم

*

تاتۆم نەویست

گوندی دیلم نەبینی بوو

خۆشەویستیم ئەڤینی بوو

تاتۆم نەویست، نەڕەی ئاغەم نەبیستبوو

ڕۆژی شۆڕش..

وابەزوویی.. هەڵهاتنی نەویستبوو

*

خۆشەویستم

ئەی مۆمی تامەزرۆی هەستم

وشەی گەرمت

نەخشەی ژینی پێشووی دڕیم

لەمەنجەنیقی تۆی دڕیم

لەمەنجەنیقی تۆی ئازیز

بەناو هەژارانا فڕیم

دڵگیر مەبە.. هێزی باڵی بێئارامیم

بەخۆشەویستی تۆ کڕیم.

شوباتی ١٩٧٢

# چوار دیاری مەزن

-١-

یەکەم دیاریٚ
مشتێ خوێنی چاوی قازیو
دڵی (خوله[1])ی پڕ لەبخوور
مەشخەڵێکی بڵێسە سوور
بەوایەری دەماری گەل
هەڵدەگیرسێ
لەبیری نەوت
لەرووباری خوێن دەپرسێ

---

[1] خووله: شێخ مەحمودی نەمرە

-٢-

دووەم دیاری (تاپلۆیەکە)

بازووی هەژار..

زگ بسییەکانی یەکگرتوو

وەک چەپکە تیشکی دەم کەلی

چاوی زیندوو

بەملوانکەی ئارەقەو خوێن.

شەتەک دراوە

چاوی دەوێ بیر بناسێ

لەکوردستان..

ئەم ملوانکەیە هەڵواسێ

-٣-

سێیەم دیاری (یادگارە...)

یادگاری نووچی شۆڕش: مۆسیقایە

لەژێر تیشکی گوللەو تفەنگ

لەسەر لاشەی چەوسێنەراندا هەرایە

سروودی جەنگ

دەنگ خۆشێکی دڕی دەوێ

تا لەپەیژەی..

ئاوازی شۆڕش سەرکەویٚ

-٤-

چوارەم دیاری (رزگاری)یە:

ئەی ئافرەتی دایکی چاوسوور

بۆتۆ: دیاریم، هێنا لەدوور

گیانی (ڤالنتینا)و (خانزاد)

دووباڵی زێڕینی ئازاد

تالەدورگەی دیلی ژیان

ئازا بفڕێ..

تافرمێسکی

چەوسانەوەی پێشوو بسڕێ.

١٩٧٢/٧/١

لەگۆڤاری دەنگی مۆسیقا، ژمارە ٨ی ١٩٧٣ بڵاوکراوەتەوە

# چوار پێشمەرگەی دایکێك

ئەگەر رۆڵە..

چاوت بۆستەی خۆری پێیە

دڵت وێنەی منی پێیە..

باماچت کەم.

گەر هەناسەت..

هەوری بەبارانی پێیە

یا فرمێسکی خەڵاتی شارانی پێیە

زوو پێم بڵێ، بابتناسم

من تامەزرۆی دوورناسێکم

پوولی نامەی شۆڕش بێنێ

بروسکەی چاوی (ماردین)ی

کوردی هەژار ببزوێنێ

زووچێم بڵێ، تابتناسم

دەبێت گوللەت.. بەرەی خوانی

تەلاری ژان وەک مافووری خوێنی گەل

داتەکێنێ

-٢-

گەردەلوولی

هەوێزی ناو کۆڵانی دێ

چاوی شەوی دوێنێکەمان پڕ خۆڵ دەکا

کوڵێنگی کوێر..

دارتێلی ژێر، روناهیمان بن کۆڵ دەکا

یاسای چەتری درِندەی (شاه)

لەهەناسەی هەنووکەمان
راوی بەرخی ئاسۆ دەکا
پەپوولەی نێو زەردەخەنەش
چاوەڕوانی چرا جەرگی (مەکۆ) دەکا
ساگریانی چاوی دوێنێ
ئەمڕۆ گوللە لە (مەهاباد)
فرمێسکێکی گڕ دەتکێنێ
-٣-
وا خەریکە مەرەکەبی پاندانی بیر
بۆ نووسینی بەچکەی شیعر، بویتە ئەسیر
لەکالانی شەوی دیلی
کەسەرەتای تیغی تاسەم هەڵدەکێشم
دەکوڵێتەوە. برینەکانی پڕ ئێشم
لەحەلەبدا، لەدێرەزوور

(حەب)ی مردن، بەدەم گەرووی خەم دەسپێرم
دەرزی ژیان، لەتەرۆکی زیندوو دەدەم
پزیشکێکیان لەخوارەوە بۆ دەنێرم
-٤-
ئەی خانەخێ.. دەپێم بڵێ
تۆ نهێنی، پایزی من پێ دەزانی!
لە (مەلحەمە)ی برینی. برسێتی ژیان
زۆر رەوانی.
هاتوومە لات:
چیرۆکی فرمێسکی شوسەی شەقامی خوێن بگێڕەوە
چیرۆکی ئاگری بەری..
چەند ساڵەی خوین بگێڕەوە
وەڵامی نەورۆزی دوێنێ..

بەپاپۆڕی دەریای مێژوو بنێرەوە

منی میوان.. لەهەولێرا..

نیشتمانی جۆخینی نان..دەپارێزم

سانتیمێکی نەخشەی گێتی

دەخەمەوە ناوە ئامێزم.

نەورۆزی ١٩٧٣

# کێ.. لەسەر بەرزی بەرتەمەنترە

## وتەی چەوساوەیەك

لەرۆژنامەی ( بیری نوێ ) بلاوکراوەتەوە.

(خۆر) بێزار بوو لەبێدەنگی

لەتاریکی و لەدرێژی شەو

سڕبوو. وشەی: (کەی دێ). گەنگێ؟!؟!

لەپرسینی هەواڵی شار

لەپرسینی، کۆتایی خەو

*

لەپەرستگای خەونی وشە. دەممان سوا

ساڵو رۆژمان تەرخان کرد بۆ بێدەنگی خوا

لووتو دەمو سییەکانمان

لەمژینی بۆنی کەلاکی نەوسنی، پەنگدراوە

ویژدانی راست، لەئازاری ژینی ئەمڕۆ

لەسێدارە.. پەتی دوێنێی لەمل کراوە

*جەندرمەکانی تاریکی پێیان وتم..

لەدیدەنی خۆری ژینا.. چاوی گەشم ببەستمەوە

*بەدبینەکان پێیان وتم:

دڵی زیندووم، لەگۆڕێکا، بەهەردوو پێ بپەستمەوە

*دەنگ ناسازان، پێیان وتم:

سروودەکەی دڵی گریاو تۆمار نەکەم

*ترسنۆکە جێ گەرمەکان پێیان وتم:

لەکوشتن‌و چەوسانەوەش، هاوار نەکەم

پێیان وتم، تەڵقینیان دام

بەخوترمەی سوودی خۆیان، لەزینیاندام

هەتا خێرا، فێریانکردم

بەرەو ئاسۆی پێچەوانەی خۆیان بردم

ئەوکاتە هات.. لەدایک بێ مناڵی خەم

ئەوکاتە هات.. پێنووسەکەم گڕبنووسێ

بنووسم (هەم) هەر بڵێم (هەم)!

ئەوکاتە هات.. ئاوازە زۆر گریاوەکەم

بەسروودی وشەی نەمر. چەوساوەکان گشت بپرسێ

ئەوکاتە هات.. وشەکانم، لەسنووری ناو سێدارە رزگار بکەم

ئەوکاتە هات.. قەلی برسی هەڵفرێنم

بەسەربەستی بڵێم، بخۆم، بەوریایی، هاوار بکەم

/ /١٩٧٢

# شیعر بەبووك دەبەن

دەچم شیعرێک لەبیری زامم هەڵکەنم

کەهەر نرخی مەرەکەبی، هەستی تێچێ

دەچم شیعرێک لەخۆری رازم دەخوازم

گریاوی بێ:

بەتەوسەوە بۆی پێکەنم

زامی کوڵ بێ، هاوار بکا، بەنوقورچێ

تابلۆیەک بێ:

دەریای چاوی خۆشەویستی لێدەردەکەوێ
جووتێ دڵدار لەژێر چەقووی نەریتی کۆن
بەتاسەوە یەکیان بوێ
دەچم شیعرێک لەبیری زامم دەخوازم
دیمەنێ بێت.
بێپارەیی و گیرفانی لاڵێ تێدابێ
پردێ رووخاو..
کەژاوەی یاری پێدابێ
شانۆیەک بێت: گرمەی هەوری باوکی توورە
دڵێک لەخەم بخنکێنێ
خەڵووزی رق..
وێنەو نامەی نەخشەی دوارۆژ بسوتێنێ
شانۆیەک بێت:

دایکی بێزار، لەپی دەستی بکێشێ بەهەردوو چاوی
بزەی لێوی خۆشەویستیش
وەک کۆترێ..
هەڵبنیشێ بەتاساوی..
*
دەزانن من کچێکم خواست
بەڵام شیعرێک دەگۆزمەوە
دەزانن من گیانێکم راست
دەرگەی ئازار.. دەدۆزمەوە؟
*
ئەمڕۆ هەندێ وشەم خۆشویست
شیعرێکی شۆخم لێچنی
پیتەکانم هەڵگیرساندو..
ئاواتێکم خستە بنی.

١٩٧٢/٨/٣

# دوا ماچی وشە

بۆکچێکی مامۆستا کەهەر بەخوشکی خۆممزانیبوو.

سەردەمێ بوو.. چۆکی سوجدەی من پەرستیت

لەسەر تاڵی ئامانجی دوور.. چاک سواربوو

تالێرە بووی.. پەیکەری من

لەناو باخچەی پڕ لەمیوەی نیاز روابوو

*

مافی خۆت بوو، کەوا خۆت بۆ من هەڵگری

خەمی تەڵخی بەتەنیاییت

بەئاگری من پەرستیت

لەئاسمانی شوێن پێی خانزادا داگری

*

ئەی ئەو نازەی
گەردەلوول بووی لەڕووی لاوێ
ئەی ئەو فیزەی، وەکو بیرێ.. تەنیا خۆتت خستە ناوێ
*

ئەی کۆچ کردو..
لەساڵی پار.. زۆر جار ویستت
جامی یەکەم خۆشەویستیم پێبڕێژی
زۆرجار وتت: دەبێ شێوەی دەسگیرانت
لەگۆڕی یادا بنێژی.
بەڵام تەمی دڵی هەڵچووت
لەگەڵ شیعرم نەبوو بەجووت.
*

لەپارەوە.. ئاشی ئاوی خۆشەویستیت

دەنگی دەهات

تاکۆچی تۆ.. مزگێنی تیشکی ناوی من

هەستی روناکی ناوی من لەدەم کەلا زوو هەڵدەهات

*

ئەی کۆچکردوو..

دادگای شیعری شاری کۆیە

بابزانێ.. ئۆباڵی ئازاری خۆتت لەئەستۆیە

ئاخر تەمی دڵی هەڵچووت

لەگەڵ شیعرم نەبوو بەجووت

*

دوای کۆچی تۆ.. شیعری هەتیو..

هەموو ڕۆژێ لەشوێنەواری ڕێگاتا

لەپێخوستی هەنگاوەکانت دەگەڕێ

لەنێو کۆڕی دەستەی خوشکان لەجێگاتا

لەڕۆژباشی، نێو چاوەکانت دەگەڕێ

وا بەدوای باسێ دەگەڕێ

باسی تۆ بێ

بەدوای وتەیەک دەگەڕێ

شیرین بەسۆز.. بەتام وەک سوپاسی تۆ بێ

١٩٧٢/١٠/١٤

هەریر

# سەرەتای لەدایکبوون

هاشەی بای با... بوو،

پۆستەی بارانی هێنا بوو

لێی نووسرابوو

ئەی هەژارانی ماف خوراو

لەخاکی زێڕینی لالّ

لەوەرزی ساردی ئەمسالّ

خێوەتی باوەڕ داکوتن

دەی داکوتن.. گورزی بەکار

خێرا وریا، بچۆ بۆ شار

لێی نووسرابوو..

ئەی هەژارانی ماف خوراو

با ئەستێرە.. ببارێتە شەوی کەڕی جگەر سووتاو

لێی نووسرابوو.

بۆ شەوی ونبوونی مێژوو

(ئەدیسۆن)ی کارەبای بیر

بابێتە ناو.. بابێتە سەر شانۆی یەخسیر

*

دەنگی دەنگێ

خوڕەی خوێنی دڵی چیابوو

زۆر گریابوو

لەناو کێڵگەو تەبارەی رەنجی ئەم گەلە

ملوانکەی فرمێسکی زیوین

بەهەشتاوی زۆر بەپەلە

چیرۆکی ئارەقەی ژینی دەگێڕاوە
نوێنی خەوی جوتیارانی دەپێچاوە
دەی گێڕاوە..
ئارەقەی چاو.. هەوجاڕو داس
لەژێر رەشماڵی بێگاری
خۆیان یەکجار برسی تر بوون.
گۆزەی رقی دیلی پڕ بوون
دەی گێڕاوە
دەنگێ بەکوڵ دەی گێڕاوە
جوتیارەکان.. نوێنی خەویان دەپێچاوە
لەگەڵ گزیرو تێخوڕینی سەر رەوسە
لاشەی مردن لەدایک بوو.
راپەڕین و هەڵمەت بردن لەدایک بوو

لەگۆڤاری (بیری نوێ) بڵاوکرایەوە
١٩٧٢/١١/١٠

# پێکەنینێك لەباوەشی گریانا

چاوێکی تیژ.. لەژێر چاویلکەی بەردەسێڵ
بیر بەنینۆک هەڵدەکەنێ.
بەقاندەرمەی قەڵاتی کورد هەڵدەگەڕێو..
بۆداهاتووی چاوی خوێنین، پێدەکەنێ.
لەراپۆرتی ئارەق رێژێکا نووساربوو:
هەرچی بڵێم تەمی هەوا دەی قۆستەوە
تەرازووی شەو.. بەدوامەوە
خۆی دەکێشێ.
بلدۆزەری سەرەتای سوور
دەیان قۆرتی دێتە پێشێ.
هەرچی بڵێم/ وەک بولبولێ

دەخرێتە ناو قەفەسێکی خەمی بێدەنگ

بۆیە هێشتا

مستەکۆڵەی.. هەستی رەنجی تروسکەی شەنگ

لەکالأنی گڕی خۆرا هەڵناکێشم

لەراپۆرتی ئارەق رێژێکا نووساربوو:

هەرچی بڵێم:

لەمزگەوتا.. لەدیوەخانی گریانا

کۆترێکە.. هەڵگیرسێنی گڕی.. شڕی

بەبیرهاتووی.. ئەهریمەنی لانسی خەوە

ناڵێم (ناڵێم)! تا بەژانی خۆم دەتەقم

زامی بێدەنگ..

سواخی ژووری دەنووکی جەنگ.

وتی: ئەی سواری ئامادە.. پێشمان کەوە

فریای شۆخی.. ئەو گیان، بەخوێنانە کەوە

بیرهەڵکەنێکی زۆر تینوو..

لەقولایی ناخی برسی

دڵ بزوێنی کارێزێکە

باخچەکانی سەوڵی دەریا.. رقی گوڵەکانێ وشکە

کۆرپەی رەگی کێوی ئاوات..

هەر تامەزرۆی ئامێزێکە.. ئامێزێکە.

نان برسیە.. چونکە لەسەر خوانی رەنجی هەژار دوورە

ئاو تینوە.. چونکە ئاوی زێراب.. (ئاوە).!

خەم دڵخۆشە.. کراسی بێدەنگی سوورە

هەڵمی ماندوو بەئاواتە..

لەجێگەی شەو ئالآی سبەینە هەڵواسێ

لەعەردی رەنج گەنمی بەرهەم بدورتەوە

بەئاواتە.. دڵدارەکانی ئارەقەی دڵ بناسێ

هەڵمی ماندوو

بێبارانە.. دەمی داسی بێبەرهەمە

زەوییەکانی، باوەڕی گەل

نایانەوێ. شین بێتەوە، دڕکی چیلکەی ئەم ستەمە

کامێراکەی چاوی ماندوو..

جارێکی تر وابە (تیشک*) سینگی هەمووان دەپشکنێ

جارێکی تر.. وێنەکانمان..

لەگەرۆمەی ئاوڕی دوور دەشواتەوە

وەکو دەریا..

ئاوی جۆگەو رووبارەکان.. دەخواتەوە..

١٩٧٣/٧/١٤

*تیشك (اشعه).

لە کۆرێکی ئەدەبی خوێندرایەوە

# ژانی شۆڕشی سبەینێ

لەمیهرەجانێك لەکەرکوك بەبۆنەی ١٦ی ئاب سازکرا.
شاعیرانی شارەکانی کوردستان بەشدار بوون، خوێندارییەوە.

**لەدوێنێوە.. وا دەپرسم**
**کەی خۆر هەڵدێ، لەچاوی تۆ**
**هاتم، هاتووم..**
**کەی بیابانی من ماچ دەکا**
**کەی ڕێی دووری دڵم دەبڕێ**
**کەی دێ..**
**بێ وتینوێتیی گەرووی ژینی من ماچ بکا؟**

*

سەرگوزشتەی مناڵی بووم

لەباراشی خەمی ئەمڕۆ..

گەرمْ گەڕام..

کەدیتمەوە..

بۆم بار نەکرا.. بۆم لێ نەکرا..

ئاورِم داوە.. ئاشەوانێک هاتە فریام

سەر گوزشتەی تفەنگی سوارا

خەوی دەهات..

زۆر نەمابوو، رانە مەڕێک..

لەپاوانی مردن راخات

مناڵێ بووم..

لەکۆریتی هەژاریدا.. دەنگێکم بیست

گریانم بیست.. هاوارم بیست

شەو تێپەڕی، رۆژ تێپەڕی.. خەوم نەها

تومەز کچ و کوڕی خەبات

یەکیان دەویست..

ژەهری دوژمن.. نەیتوانیبوو لێکیان بکات

*

سەرگوزشتەی منالێ بووم

بەدەزووی کۆلارەی ئاشتی

هەڵگەڕامە، سەر قۆنداغی، کێوی ئارام

کەسەیرم کرد..

تائاگریش.. لەجیاتی نەوت.

بڵێسەکەی هەر خوێناوە

کە گێڕامەوە، بۆ دایکم

وتم: دایە برژانگی مێژووی چەند ساڵەم

لەناو زامی کۆتریکی دەنوک سوورا، هەڵهێناوە

*

سەرگوزشتەی هەزارێ بووم

لەتینوێتیی گەرووی چرای تارم پرسی: بۆ بێئاوی

وتی: ئاخر روبارەکان پڕ لەزێروون.

لەئافرەتی ناو کەلاوەی ژانم پرسی: بۆ بێپیاوی

وتی: هێشتا کەس نەیخواستووم

لەدڵداریم نەگەیشتوون

سەر گوزشتەی منالێ بووم:

لەرۆشنایی چاوم پرسی: بۆ بێپشووی

وتی: هەرچی من دەی بینیم وا چەوساوەن

لەماندوێتی قاچم پرسی: تۆ بۆ ماندووی؟

وتی: هەندێ.. زۆر حەساوەن.

زەنگی دڵی کاروانی خۆر هێشتا ماتە

باستیلی شار.. سپارتاکۆسی تیا قاتە

*

هاتم هاتم، ئەمڕۆ لە ژێر سێبەری زام
ئێمەی بەچکەی مێژوو ناکام
چۆن ڕزگار بین پرسیارمانە
پرسیاری کورد یەکجار زۆرە
وەڵامەکەی..
لەبەهاری کوردستانی ڕزگارایە
لەتێربوونی زگی برسیی هەژارایە.

١٩٧٢/٦/٢٨

# کێ لەسەر بەرزی بەتەمەنترە

گوڵێ خۆزگە..

چۆن بۆ چڵی داری ژیانی دەگەڕێ

یاچۆن سعات قورمیشی خۆی لێونبووەو

ئارەقەی دواکەوتن دەسڕێ.

گیانە منیش وێڵی چاوتم..

سەد ئەوەندە لێت دەگەڕێم

*

بەفری لوتکەی خەمی ئامان.. لەبارانی خۆی دەترسێ

شەوی ئەمڕۆش لەسبەینەی بەهارانی خۆی دەترسێ

منی گرێش.. بەخۆشەویستی تۆ هەڵبووم

لەوەتی هەم.. خوێنی دڵ لەبۆرییەکانی خۆی دەپرسێ.

خۆشەویستم..گوللەو برین دۆستی یەکن

گریەو خۆشیش.. ژانو ناڵەو هەستی یەکن

پێکەنینی لێوی وشک.. دەڕژێتە ناو..

چاوی گریاو..

خۆشەویستم بویتە مەکۆی..

ویژدانێکی لەخەو هەڵساو

رەنگە وشەی خۆشەویستی

لای هەندێ کەس چاک سوایە

گیانە.. نازی خۆشەویستیت

گەر هێز نەبێ نوزەی نایە

*

باكیژۆڵەكان بزانن..

من خۆشەویستێکم هەیە

هەموو رۆژێ.. لەسەر شەقامی رووی چەقۆ

ماچم دەكا، ماچی دەكەم

لەبەرزایی ئەستێرەو خۆر.. هەزار پەرستێکم هەیە

لەباوەشیا.. بێچوە ئاگرێ هەڵدەێنم

لەسەر مێزی جۆخینی رق.. گەرووی خورپن دەنووسێنم

دەی پەرستم.. دەمپەرستێ

*

بائافرەتەكان بزانن

زۆر لەمێژە.. هەناسەی ژینی بێزارم

خۆزگە خوازی هەوای پاكە

زۆر لەمێژە.. رێگەی خۆشەویستیم تاكە

چەنگەڵی پڕ..

ىوىدو چیای بەبومب سڕ

بەستەیەکە.. سرودێکە..

هەر ماندویەک خەوتن نەبێ چاری ناکا

هەر شۆڕێک.. گوللە نەبێ باری ناکا

*

گیانە ..گیانە.. وەرە بڕۆین..

ئایا ئاگر. دێتە بیری، پێچەو عەبا بسووتێنێ.

ئایا خەنجەر دێتە بیری، پەتی خنکان بقرتێنێ

ئەی چیاکان..

ئایا روبار لەترسانا چیتر بەرەو هەوراز دەڕوا

ئەی جوتیاران.. ئەی هەژاران

تاکەی ئاغا، تەلارەکەی بەئارەقەی ئێوە بشوا.

خەمەکانمان وادەپرسن

ئایا ئایا خوێنەکانمان، شەهیدانیان لەبیرماوە

هەتیوەکان.. باوکەکانیان لەبیرماوە

لەسەر شەقامی رووی چەقۆ

خۆشەویستم کاتێ خێرا ماچم کردی

گەر بپرسم

ئایا ئایا، تۆش موچڕکی لێوی منت لەبیرماوە

هاوڕێکانم وەرن بڕۆین..

بەرەو ئاهەنگ..

ئەو ئاهەنگەی.. سەرگوزشتەی سواڵکەرەکان تۆمار دەکا

بۆ ئاهەنگێ.. شانۆگەری مەیدانی کار، لەشاعیرانا بار دەکا

خۆشەویستم..

لەنامەکەت، زەنگوڵی شەو بەچکەی موژدەم هەڵدەسێنێ

بۆن باروودی نامەی دەرزن

شادبوونەوەی ناو قەفەسی شاری ئەنجن

هاوار دەکەن..

تەلاری سەربەرزی کۆمەڵ، هەژار نەبێ بەرزی ناکا

(رزگاری گەل) خۆراییش بێ..

(پیسکەی تەرپیر) قەرزی ناکا.

*

لەکاتێکا، کە ئاگرمان دەکردەوە

دەستی لافاو.. نامەکەی تۆی پێگەیاندم

کەتەلەفزیۆنم کردەوە

گریانەکەت.. چیرۆکێکی دڵسۆزانەی بۆ نواندم

ئەریٚ گیانە

ئەریٚ گیانە..

ئیتر نامەم بۆ مەنێرە

پوولی پۆستە نامەکانت دەپشکنیٚ

سندووقی سوور..

گۆڕی مردن.. بۆ وشەی جوان هەڵدەکەنیٚ

ئیتر نامەم بۆ مەنێرە..

بەڕێگەی کۆن بۆم مەنێرە..

تا دێمە لات.. یا تۆ بەخۆت دێیتە ئێرە

١٩٧٣/٨/٢

# با کوردستان شەهید نەبێ

من ئەو شەوەم.. لەتاریکی ڕەویمەوە
بەیانی هات.. جانتای هیوای ئەو منداڵەم، لەخوێندنگای دێنێتەوە
ئەلفبای سەر تەختەی زامی خەناوی هات
هاتووم بڵێم.. ئەو برینەم، لەزستانا تەشەنە بووم
پەنجەی هێرۆشیمای ئازار.. چڵی زەیتوونی سوور کردم
بۆنان، بۆ ماف، بۆ قومێ ئاو.. تووشی دەیان فەرتەنە بووم
شەهیدەکان
وادێمە لای گۆڕەکانتان..
پەڕۆی کێلی مەزارگەکان.
دەس بەدوعای پەسارگەکان
قولاب لەجەرگم گیردەکەن

ئاوی بەرەو هەورازی دێ.. ئارەقەی چاو یەخسیر دەکەن
شەهیدەکان.. گوللە تەقێنراوەکەتان
سەدان نەجمەی نیشتووی سەرشانی سەبرِی
سوپای سووری خەمەکانتان
دەیان سێدارەی جێماوی لەئۆردووگای خوێن دادرِی
گوڵی هیواچێنی دڵتان
لەقەد پاڵی ئەمرۆ سبەی
لەسەرچاوەی خوێنەکانتان سەردەردێنێ
گۆرِەکانتان خەو دەنوێنێ
خۆزیە وتە بەناو گەرووی کردارمانا دەپەرِیەوە
خۆزیە تۆڵەی خوێنەکانتان
ئاشتی بەکۆڵی دادەداو..
پاپۆرِی خۆر.. لەناو دەریای گریانمانا دەپەرِیەوە
*

شەهیدەکان

لەکەلەشی هەمووتانا، لەپەنجەرەی گوڵی گەنم

دەمانتوانی کوردستانێ دروست بکەین

لەدورگەی زامی ناو خوێنی هەمووتانا

دەمانتوانی ئالأی دەستی منالّەکان بچەقێنین

هاتووم بڵێم لەناو گڕی هەمووتانا... دەمانتوانی کارەبا ـ بین

بۆ ملی بۆرییە نەوتەکان.. خەناوکەی سوور دروست بکەین

بەلأم بەلأم، لەسەرمایەی چاوەڕوانی

مەلا چۆمبی.. نازم گزار زۆری کردین بەقوربانی

*

پێتان بڵێم

باخی شانۆ، گوڵی ئێمەی لێبۆن دەکرێ

رستی جل شۆرینی دلّمان. دلّۆپی سووری لیّ دەتکێ

دیسانەوە، گڕی لوولەی هەناسەمان

بەزنجیری مەرگ چێنی دوژمن هەلّدەواسن

برسیەکانی کۆلێرەی ناو تەنووری قین

دیسانەوە توخوبی گیان دەبەزێنن

برسییەکانی تەبارەی خوێن

بەرچنەیەک مێوەی رقی کوردیان دەوێ

شەهیدەکان..

بۆ ئەوانەی لەژیانی سەربەرزیاو شەهید بوونتان

نێوانتانن

بۆ ئەوانەی میوانتانن

لەوێش سنووری سەربەخۆیی هەڵکەنن.

*

هاتووم بڵێم..

لەسەنگەری برسێتیدا، ئەگەر گوللە روناکیم بێ

قۆڕەی سکم پاسەوانی جۆخینم بێ

دیسانەوە.. رەنجی هەرزان فرۆشی من، هەر تینوە

گەر بەنوشتەی بن باڵی کۆتری مێژوو

فاڵچیو مەلا سەرقەڵەمانە وەرگرن

دروشمی سەر دیوارەکان، لێی دەنووسرێ.

تف لەوتەی سەرمینبەری درۆزنەکان

ئای بۆ خوێنی بەفیڕۆ چووی شەهیدەکان

*

هاتووم هاتووم

هاتووم گوڵی ئارەزووتان دابچێنم

هاتووم چقڵی حوزەیرانتان بدورمەوە

هاتووم داسی کولی سەپان بسومەوە

هاتووم مناڵی ناو سکتان.. هەڵسێنمە پێ

هاتووم تۆپی هەژار بێنم، بێو بنەقێ

*

**وەرن، وەرن. گیرفانی چەک بپشکنن**

**هەر گوللەیەک چروک دەرچێ.. بیبەنەوە**

**خێرا، وەرن دەرگەی شۆڕش بکەنەوە**

**زامی مێژوو، لەسەرچاوەی بابەگوڕگوڕ بشۆنەوە**

**وەرن، وەرن، خوێنی دەمارەکانی گەل شێکەنەوە**

**کاروانی کورد، بەسەر پردی ویستو زامی هەزار بەرن**

**باپرسین... کامە چینن،**

**لەشۆڕشی ئەمجارەشمانا کۆچەرن.**

**١٩٧٣/٩/٩**

-بەبۆنەی رۆژی شەهیدانی ١٩٧٣ خوێندرایەوە

(ئەوەبوو پارتی بەیاننامەیەکی دژ دەرکردم، بەدژی رێبازی (پ.د.ك)ی دامە قەڵەم. لەدەزگا رۆشنبیرییەکان دەریان کردم..؟)

# مردن لەگۆڕی سەرشۆڕی دەژیت

لەکۆڕێکی ئەدەبی خوێندرایەوە

کاتێ ئاگر.. لەئاوپرژێن نەدەوەستا

خەرمانی رەش..

خیزی گەردووی خستبووە ناو دەریای ترسا

ئەستێرەکان.. ئاوازی شەویان دەمژی

روبارەکان.. کەنارەکانی خۆیان خوارد

گوڵەگەنم.. دەنکەکانی دابە کللۆ..

داسیان بەزستانا سپارد

گەڕامەوە لەلای مردن گەڕامەوە

*

پێتان بڵێم.. مردن چییە:

مردن، مردن.. بووجەیەکە بۆ پوول دەگری

مردن چاڵە، بۆ گیانێکی زیندوو دەگری

قاندرمەی کارتۆنی ترسە

چۆن دز دەمرێو بەسەرشانی خەڵکا دەفڕێ

ئای چەند سەیرە..

پێش ئەوەی ناویان ژیان بێ

زۆر کەس ناوی لێنرا مردن

*

پێتان بڵێم مردن کێیە

مردن سکەو لەتێریدا دەڕشێتەوە

مردن گوڵە.. لەسەر شۆڕی

وەکو بووک دەگەشێتەوە

ئای چەند سەیرە.. پێش ئەوەی ناویان ژیان بێ

زۆر کەس ناوی لێنرا مردن.

*

کەلای مردن گەڕامەوە

دووکانی شەو.. مومی کاروانێکی دامێ

خێرا وتی.. کوانی زامێ.. کوانی زامێ

وەک برینی شاری ئاگر، قوڵو کوڵ بێ

هاوارم کرد.. کوا گوڵ وەک لە

زەوی خوێنا روا (گوڵ بێ).

*

کە لای مردن گەڕامەوە

ئافرەتێکی زگ پڕی لات خۆی دەکێشا

گرانییەکەی.. تفەنگێکی پڕ فیشەک بوو

لەژێر لکە زەیتونێکا، گڕی دەخوارد

لەپڕ دیتم: منداڵێکی گەنم رەنگی خۆی لەتەک بوو.

*

راكەن راكەن.

تەمەنی خەم وا گەیشتە تافی پیری

دەتکە تەسبێح لەسەر زامی خۆی دەژمێری

ئاخۆ کێیە.. لەتاریکی بانگ رادێرێ

تکیتی قین.. لەپاسی ئاشتی هەرزانە

لەبازاڕی رەنجی هەژار

خۆشەویستی مەزات دەکا

پەیکەرێکی باڵ شکاومان..

خەڵات دەکا.

١٩٧٣/٧/١٨

# هۆنراوەی منالآن

## منالی سەردەمی ژانو خەم

هۆنراوەکان لەبەندینخانە وتراون

### گوانێ بابە

بابە، بابە

سەهۆڵی خەم لەدڵ لابە

بەسیە دووری..

خۆ تۆ ئاگرێکی سووری

*

بابە، بابە

چاوی بەیانی هەڵدێنم

تۆی رزگار بووی تیا دەبینم

رۆژیش خێرا، شەو راودەنێ

موژدەی سەربەرزیت دەدەنێ

*

بابە مەڵێ دەست بەستراوم

لەبەندینخانە گیراوم

خۆێنت لەدڵما ناسرەوێ

هەرگیز تۆمان، زۆر خۆشدەوی

١٩٧٨/٨/١٠

# بۆسێ کیژۆڵەکەم

-١-

کیژۆڵەکان..
جاران وابوو..
گەر چۆلەکە.. بفڕیبایە، بەناو ڕەزی
کێوەکانتان
باڵی دەشکا.
گەر شەپۆلی پێکەنینتان
برژابایە، دەریای حەزی هیواکانتان
حەیاو دەتکا..

منی گەنجیش.. وەک بولبولی باخی گریاو
باڵ شکاوی عەشقی (شەم) بووم
لەناو هیوای ئاگرینی کیژۆڵەکان
گڕبووم دەژیام
نەک ئەسرین ڕێژ
هەر خۆم چەم بووم.
کیژۆڵەکان.. دەمویست خۆربم
لەناو کەلی سینگی کچا چاوهەڵبێنم
دەمویست خۆربم، تۆقەی گوڵ بم
ئارەقەی شەرمی ناو بوخچەی رازی دڵ بم
دەمویست زامی داگیرساوی شۆخی بەند بم
تاله ئەشکی دەسگیرانی بیرەکانم
باڵی فڕینی بۆ بێنم

-٢-

کیژۆڵەکان.. نووکەمرۆی ئافرەتێکم

ماچی ژیانی لێدەکەم

خۆشەویستی ئافرەتێکم

لەشکری کیژی سەردەمی، پێ زۆر دەکەم

ئەمڕۆ باوکی سێ کیژۆڵەم

باڵی فڕینی سەربەستی، سێ بچکۆڵەم

ئەو جۆگەیەم.. شەپۆلی پێکەنینتانم لێڕەتدەبێ

تاکو شەوەی بەرئاگردان

دارلاستیکی، پەنجەی رقی شەکەت دەبێ

١٩٧٧/٩/٢٣

# بروسکەیەك لەدڵەوە

پێشکەشە بەو قوتابیانەی تازە چرۆ بوونو بەزۆر لێکیان دابڕین

**شاگردەکان.. جێتانم هێشت**

**کەجێم هێشتن**

**سەرکەوتنتان..**

**هێشتا بێچووی ناو هێلانەی تێکۆشان بوو**

**کەجێم هێشتن..**

**ئازوخەی ماڵوێرانیتان**

**لەناو تەرازووی کێشان بوو**

**ڕۆیشتم و .. خۆشەویستیم.**

**ماڵئاوایی لەیادگارتانا نەکرد**

**ئستەش چاوم لەگریانە**

**لەئێوەیان دابریمو خستمیانە بەندیخانە**

**ڕۆیشتمو بەهاری سوور**

مەلەی لەناو روبارتانا نەکرد

خۆشەویستیم..

ماڵئاوایی لەیادگارتانا نەکرد

شاگردەکان..

حەزم دەکرد گەرمییەک بم

لەژێر جلی دڕاوتانا..

راوی تەزووی زستان بکەم

حەزم دەکرد ئاسمانێ بم

گوللەی سامی بزەی ئێوەم لێتێپەڕێو

پاسی بەری بێستان بکەم

دوورنیم لێتان

مناڵەکان..

لەڕۆژ باشا.. لەسردوودی بەرەبەیان

دەتان بێنم

لەگەڵتانم.. لەخاوێنیو..

ئاوێنەی دیواری ڤیان.. دەتان بێنم

مناڵەکان..

وەک شاگردێ وەک فێرکارێ

هاوەڵتانم

لەگەڵ زەنگی هەموو بەیان

وەک چەپکە نێرگزی ژیان

لەگەڵتانم،. شاگردەکان

دوورنیم لێتان

نزیکتانم

توخمی شیلەی گوڵە گەنمی فەریکتانم

لەناو جانتای کتێبتانا

دەرس و شیکاری شەوتانم

نزیکتانم

کاوەی نەورۆزی خەوتانم

لەهاتوو چۆی قوتابخانە

دڵم لەناو دڵتانایە

پەپولەی زیندانی تەمەن

لەناو باخی گوڵتانایە

شاگردەکان..

لەفێرگەی خۆشەویستیتان

بەپڕ پۆلە خوێندەواری

مرۆی ئازا، بەخێو دەکەم

لەناو مێرگی سەرەمەرگا، وەک چەتەیەکی ماڵوێران

ئێوەی بوێر، بزێو دەکەم

شاگردەکان

ئێوەن شۆفێری شابیری چاڵی مێژوو

ئێوەن بەری گۆڕستانی ژینی پێشوو

ئێوە داسی هاوێنێکن

درەوی بەفری دۆڵ دەکەن

ئوتێلی ناو دێهاتی گیان

بەفرۆکەی زام چۆڵ دەکەن

شاگردەکان.. بەمن دەڵێن: لێمان دوورە

واتێنەگەن..! هەرگیز کۆتری ئەندێشەم

لەچیمەن و شاخی سبەی

دەنووک سوورە

# منالّی سەردەمی ژان

مامە، خاڵە..

مەڵێن، (هەرەوەز) مناڵە

تەمەنی زامی من پیرن

کۆتری ئاسمانی شادیم

لەژێر چەقۆی خەم بەخسیرن

*

باپیره گیان..

دایکم لای لایەی لێبڕیم

یەخەی غەریبی بۆ دڕیم

تاڤگەی گریان دەڕژێتە چاو

مەلەوانی مێژووی هەستم

یادی ئاگرینی خەستم

لەگەڵ شەپۆلێکی ڕژاو

لەروباری ژانی منا

لەهەواری زەلکاوی رقی دوژمنا

لەکۆچێکا.. دادەگیرسێ

کەوی باوەشی ئازارم

لەپشکنین، لەفەلاقە

لەهەڵواسینیش ناترسێ

*

مامە، خاڵە..

مەڵێن، (هەریار)ەو مناڵە

ئەوە نییە.. مناڵەکانی شارەکەم

داوی یاریان لێدەکەم

دەڵێن جلمان لەبەرنییە

دەڵێن.. دەڵێن: کەس گەواڵەو

هەوری رەشی وەکو ئێمەی لەسەر نییە

دەڵێن: خەڵکی، لە (شەت) خنکا

باوکی ئێمە،.. بەپەت خنکا

دەڵێن: هاوڕێو خزمەکانمان

دەستو پێیان بەزنجیرە

بۆیە حەزی مناڵیمان

لەیاری شەقامو کۆڵانا.. دڵگیرە

*

مامە، خاڵە..

مەڵێن (بوێر)ەو منداڵە

ئەوە نییە.. منداڵەکانی شارەکەم

داوای یاریان، لێدەکەم

بەرەو دێهاتەکانی دەچن

لەشەوێکا..

بۆ بڕیاری.. بەرەبەیانی مل کەچن

*

مامه، خاڵه..

هێشتا شخارتەی دڵی من

لەگیرفانی ڕەشی شەوە

گوڵی تەمەنی داهاتووم

ئاوزنگی سوورەو پڕتەوە

وەک ئەسپی خۆر..

لەکۆچایەو

چاوەڕێیەو، نەهاتەوە

پێچی دووری.. بەلافاوێ.. دەخواتەوە.

١٩٧٨/٨/٢٥

# رووبار

شیلەو موچڕکی ناوزەوی
نەشەو نەرۆژ، هەر ناخەوی
مژی دەریا، دەیان کێشێ
بڵقەو خوڕەی دەنگی ناخە
هەستی گەلە، ئاسکی تینو
ڕەوێ کۆتر، سبەینە زوو
پەزی کوێستان..
ئەسپی کاروان
نوێژ بۆ شەپۆلەکان دەکەن
سامی گڕی گوللە دەبەن
لەگەڵ برژانگی کەنارا
بەرووبارا..
ڕاپۆرتی ناو لاشەی قەوان
دەگەیەنن بەئاشەوان

١٩٧٨/٧/٢٠

# کەی پاییز جەژنی گوڵ بووە..

دایک:- رۆڵە مەگری، ئەمڕۆ جەژنی منالآنە

پێکەنینی روومەتی خۆر...

جەنجەڕێکی بێکالآنە

کوڕ:- دایە جەژن، مانای چییە؟..

دایک: - رۆڵە مەگری..

واتە لەبەر ئاگردانی،ماڵی خۆمان

کولێرەی سوور دەبرژێنین

رۆڵە واتە..

حەزۆکەتان، وەکو گولاو

بەسەر گیانی دایکو باوکتان دەپرژێنین

کوڕ: - جاکوا ئەوە.. جەژنی منە

وەک هێلەگەی بەرچاوی خۆر.. هەمووی کونە

دەپێم بڵێ

دایە جەژن لەکوێوە دێ؟
دایک:- ڕۆڵە جەژن.. سواڵکەرێکە
لەشەڕواڵی گرێدراوا..
ئازوو خەی
زستانی پێیە
کاروانێکە، بەناوتیشی، چەوسانەوە
جڵەوکێشی، ئەسپی شێیە
کوڕ: جا دایە کەی دەگاتە جێ؟
دایک: کە لەفێرگەی برسێتیا
خوێندمانەوە..
بمری چەوسانەوەی ئینسان
خوێندمانەوە.. بژی هەژار
سبەی شۆڕش.. دەکا بەنان

١٩٧٨/٤/١

# ماچێکی سارد

ڕێی خۆشەویستیت دەزانم
بەڵام بەفر گرتوویەتی
چاوی حەزی تۆ دەبێنم
هەوری خەزان ڕشتوویەتی
*
ئەو گوڵەی تۆ زستان ویستت
چی بکەم هەر هاوینان هەیە
ئەو کرێوەی لەخۆر بیستت
لەوەرزی ساڵی تۆ هەیە
*

بۆچی شاخم پێدەکێڵی

کەتیشکی چاوم گاسنە

بۆ دروێنەی عەشقم دەکەی

دیارە دڵی تۆ ئاسنە!

*

بۆجۆگەی سەربێستانی سینگ

لەدەریەندی مەما دەبڕێ؟

یادی ژێر کەپری بەرگزنگ

نەکەی بۆ کۆشکی خەم بدرێ

# لەگەڵ چەمی بەهارێکا من دێمەوە
## باوك: بڕۆرەوە..

ڕۆڵە چەپکی حەزی گەرمی هێوای منی
قژیزەردی خۆرەتاوی، بزەی سواریو
زامو هاواری دوژمنی
بڕۆرەوە..
منالّ: نەء بابە گیان
با بیابان..
لەناو حوتی دەریای کەمەندی خەمدا بمکوژێ
باوەکو تۆ
لەناو سنووری حەپسێدا، گیان ببرژێ
نابابە گیان..

بەروناکی چاوی بیرت

شەوی دووریم وێران دەبێ

بەڵکو خەمی هەردووکماییش

لەیەک کفنا.. تەبا دەبێ

باوک: بڕۆرەوە..

بڕۆ رۆڵە، وەکو گەڵا لەبەهارا

گیانی دەرەختی ژینی من،

جێمەهێڵە

کڵپەی عەشقی.. راپەڕینی

من بشێلە.

١٩٧٧/٨/٩

# دووریع بزەی بەیانییە

دوررم دوورم

بەگریەی خۆم پشت ئەستوورم

مەلەوانی دەریای خەمم

زامدارێمکی بزەی سوورم

ئاگرێکەو بنی نایە

خۆشەویستم، کە دەتگەمێ

ماچی رزگاریت دەدەمێ

کڵپەی خۆشەویستی دوێنێ

خەرمانی شەو دەسوتێنێ

کاروانی دڵ دەخاتە ڕێ

دادەگیرسێ، لەشار لەدێ

دووری دەستگیرانی خۆرە

سۆزی شۆڕشی لاوازە

دوریم ژانی کپ دەبیستێ

رواوە لەخۆشەویستی

١٩٧٨/٩/١٠

# کەوش چەکوشی لاتاوانبارە

کۆمەڵە هۆنراوەیەکە لەبەندیخانە نوسراوە

## باکێڵگەکان بێباران بن

-١-

مناڵێکم، سەعات تەمەنم دەژمێرێ و جیهان دەنگم ناگرێتەخۆ

وەکو مەلێ، دابڕابێ لەهێلانەی

هەستی زیندووم، دابڕاوە، لەشیلانی مەمیلەی تۆ

خۆشەویستم، با کەمتیاری، خوترمەی دەستی زەمانە

هەموو بەزی گیانی هەژار هەڵبواسێ

بادینارێک، راوی گوڵەگەنم بکاو

گیرفانی گڕ باهاواری لەناو هەڵسێ

خۆشەویستم.. بادەنوکی کۆتری سوور

لەپەرێزی زەمینی چاو، چینە بکاو، بارانی خۆر بخواتەوە

بانووکی کەو.. بێتە سەرین، ریز بێ لەسەر هەرزاڵەی شەو

زریانی کێو.. دەرگەی بەهار داخاتەوە

خۆشەویستم.. چاک دەزانین

هەر بورغوی زوڵمی دوژمنە. سیلاک دەبێ

مێژووی مناڵی توورەییم... بەگاز گیانی دەکاتەوە

دەنگی من و هەرچی مەلە

لەروباری تێکۆشانی، باڵدارەکان دەکاتەوە

-٢-

خۆشەویستم،خۆشەوییستیت

وەک ئیمپریالیستی دوێنێ، دورگەی دڵی داگیرکردووم

برینە هەژارەکانی گەل، لەڕێکخراوی شیعری سوورا

گوندو شاری، نامەکانمی، لەباوەشی دەفتەرێکا

داگیرکردووم

-٣-

خۆشەویستم.. مناڵێکم

وەکو (مەسیح).. چرۆی زمان

لەزستانا. خونچەی ئاگر دەپشکوێنێ

منالێکم... وەکو (ئەیوب) وەکو.... وەکو...

لەناو گڵکۆی ئارامی خۆر

سواری کەستی خەبات بووەو

لەتەک هەرچی کێوی بەرزە

چاڵی گزیو خەمی مێژوو دەڕووخێنێ

وەکو شەماڵ

بەری خۆڕاگرتنی گوڵ دەجوڵێنێ

١٩٧٧/٨/١٨

# شاعیرێکم

پیرەژنێ بام... لەمنداڵدانی ژانی رق

مناڵێکی گێرم بوایە

وەکو نوقڵی بەراتی خەم

پێنووسەکان

بەدەم رۆژنامە زەردەکان

وێنەکەمیان دەکرد بەپەند

پزیشکەکان.. ئەم منداڵە ساوایەمیان لەخۆی دەسەند

کەچی ئەمرۆ، شاعیرێکم.. لەمنداڵدانی مێشکی دڵ

شعری برسیو تنووم دەبێ

پێنووسە چاو رژاوەکان.. نانێ نادەن بەوشەی گوڵ

کوێرو مردوون

بۆیە تادێ.. بەچکە گڕی هەڵچووم دەبێ

*   *   *

جومبازێ بام، لەسەر پەتی یاری شەوا

چاوی بازدانم کوێربایە

هەناسەی خەم، چەپڵەی سەرسام

نەک رۆژنامە.. هەزاران کەس لەناو دڵی خۆیان دەنام

کەچی ئەمڕۆ، شاعیرێکم

جومبازی پەتی ئازارم

کلیلی جێی نانم لایە

هاواری چەوساوەکانی، ناڵەی شارم

بەڵام لەناو گۆڤارەکان

باسی ئێمە، زامی ئێمە، نووزەی نایە

*　　*　　*

زگتێرێ بام.. باسم دەکرا

هیتلەرێ بام، سوپاسم دەکرا

دیارە منیش.. شاعیرێکم

لەناو دەنگی ئاگرینما.. خۆڵەمێشم

شاعیرێکم.. لەناو لولەی تفەنگێکا

هەناسەی ژینی رزگاری، هەڵدەکێشم

١٩٧٧/٨/٢١

لەرۆژنامەکانی خۆمان، لەئیسگەکانی بێگانە زۆر شتم لێک داوەیەوەو بەبەراورد نەدەگیشتە تۆسکاڵی مەسەلەی ئێمە کە لەبەندیخانە دەست بەستەین، هەموو کەسێ لەسەریانا، هەڵدەدەنێ..

## هەردێمەوە

هاورێکانم...

کەدێمەوە سەرم وەکو شاخی زۆزان

بەفری زۆری لێدەکەوێو،خۆری عاشق خەریکی قژداهێنانە

کەدێمەوە.. دڵم سەنگەری جوتیارەو

شەنەی جۆخین، سەوڵی کەشتیی خوێنی گیانە

شەنەی خەرمان لەناو دەروونی برژانە

هاوڕێکانم.. کەهاتمەوە

بناری چاو، بەربەرۆژکەی زستانێکەو

هێشتا بەفری لەسەربانە

*   *   *

هاوڕێکانم، کەدێمەوە

وەک (منارەی چولی) بەرزقیت دەبمەوە

کەهاتمەوە

شەقامی شار دەگوێزمەوە

لەدوکانی سوخۆرەکان، لاشە بەهەرزان دەفرۆشم

قەترانی خوێن، وەکو بازن... بەدڵداری نوێ دەفرۆشم

هاوڕێکانم.. کەهاتمەوە

وەک منارە. دێرینەکان قیت دەبمەوە

لەمیکرۆفۆنی (پێنج فەرزە)

دەبمە (نوێژو) سورەی سۆشیالیست دەخوێنم

لەریزی مام سۆفیەکانا.. (کولێرەی یەکسانیم تیایە)

لەهەموو چۆکدادانێکا... هەڵسانەوەم لەگەڵدایە

*        *        *

کەهاتمەوە.. دەبمە بەهاری کەلاوەی

قەڵاتی جاری جاران و... خۆر بۆ کۆڵانەکان، دێنین

هەرچی مناڵی گەڕەکە، گورز گورزانی دەکەن و

قەرزی کرێکارانی شار، لەخانوە بەرزەکانی هەولێر دەسێنن

* * *

کەدێمەوە.. وەکم منارەی چۆڵی بەرز، قیت دەبمەوە

کەدێمەوە.. گیانم تۆپەڵی ئاگرەو

بەچەکوشی چەوساوەکان، دادەگیرسێ

سۆزم لافاوی روبارەو

لەراماڵێنی زەلکاوی، کەس ناترسێ

١٩٧٧/١١/٩

# پیری بەندکراو

(مامە سوارە، تەمەنی پتر لە ٩٠ ساڵ دەبوو خەڵکی دێهاتەکانی چۆمان بوو، لەسەر چەك لەبەندیخانە گیرابوو بەیەکەوە دەژیاین)

•

مامە سوارە
لەروباری لۆچی رووتا، قوڕاوی شاخم لێ دیارە
لەپێچی مێژەری سەرت.. شەختەی نزاری باپیران
هێشتا وەک تێلەگە قەسەر لاتان بارە
مامە سوارە.. ئینسانێکی، مرۆڤێکی
سەد زستانت بەسەربردووە خۆت مایەوە
وەکو بەفر.. نەتوایەوە

مامەسوارە

دەیان روبار، لەبەهارا.. سەری هەڵداو

لافاو ناوی جۆگەی لێنان

فرمێسکی خۆر. .هاوین جۆگەی، بەئارەقە ژیان

مامە سوارە

لەکتێبی تەمەنی تۆ، مێژووی ئازار دەخوێنمەوە

مۆری رەنجی، رەنجبەری دێهاتەکانت

لەگیرفانی (بەگ)او (میر)ی گۆڕستانا دەبینمەوە

مامە سوارە.. تۆڕێ رێواس بەکۆڵتەوە

بارە داری قەلاشکەریت، پوووشانەی ئاخوڕی میرە

تاماندوو بوون رۆژانەت بێ.. چەوسانەوەت لەمل گیرە

* * *

مامە سوارە.. لەکتێبی تەمەنی تۆ

بالۆرەی شۆخی چەوساوەی، کەنگر لەکۆڵ دەبیستم و

حەزی لەسەپانی خۆرە

کەگەردەلوولی هەناسەی، باوەش دەگرێتە، کۆشش

رێواس لەکۆڵ لەلاوکی تەنیاییدا

سەربەست دەبێ و.. گڕی وێرانی. لازۆرە

هێزی هەڵسانی لازۆرە

لەرووباری خۆشەویستی، مەلەوانەو رووت و قووتە

شەرم لەئارەزووی ناکا

تا لەوێنەی یاسای کۆمەڵ

گورگ لەتەک (مەما) جووتە

مامە سوارە

لەکتێبی تۆ، زۆر دیمەنی نوێ دەبینم

چەرچیو دێوەرەی ژانی تۆ

کاریتەی خانووی دێیەکەت.. دەبڕنەوە

گوێزو رەزی باخی مێژووت

بەخاولی نەڕەی بلدۆزەری دوژمن دەسڕنەوە

مامە سوارە

منالەکان... چاوەڕێتن.. لەوبنارە

رۆ رۆیانە.. دەگریەن بۆ جووتێ گوارە

بۆ دەستگیرانی دێرینیش.. کوانێ گوارە

مامە سوارە. کوانێ گوارە؟

کوانێ گوارە

بێنە گوارە

١٩٧٧/١١/١٥

# کەوش... چەکوشی لاتاوانبارە

(ناوەڕۆکی دانپیانانم... تا لەدادگای کەرکوک پێ حکوم درام بە (٥) ساڵو مانگێ)

دانپیادەنێم: کەشکۆڵی ماسیم هەڵگرتو

تەوژمی رووبارێکم بەست

هێنام، نەوتی، خۆرەی تاڤگەی پێ راچەنم

لەپڕ موچڕکی کارەبا

گڵۆپی تاریکیمی گەست

دانپیادەنێم: هەژارێ بووم.. لەکۆشکی ئاسمانی خۆرا

کە(مان) لەگەڵ (مردن) تۆرا

تیشکم بۆ تاریکی دزی

دانپیادەبێنم: شخارتەیەک... دەسکەوتی گیرفان بڕینی، هاوینم بوو

پووشی ترسنۆکی زستان.. زستانی زام

کەسوتاو لێی لەهەرادام

دانپیادەنێم: هێلکەی درۆی باڵداری (ڤالدهایم)م دزی

گۆڕیمەوە بەتفەنگێ

کەخەو جوجەڵەی هەڵهێنا... رابو سازی کڵپەی دەنگێ

دانپیادەنێم: (ئافرەتێکی مەمک براوی فەلەستین)

لەناو بوخچەی قودسا دەژیا

دزیم هێنام، هێنام هێنام

مۆمێکم بۆ داگیرساندو تێر بۆی گریام

دانپیادەنێم: بیستم، بینیم (نان) دەستگیرانێکی دیلە

قاسەی دوژمن بێکلیلە

پڕمدایە، چەکو نانو دەستگیرانم

نایە کوڵی بەرەبەیان

ئەمڕۆ لەدادگادا گیران

ـصا وتی: دایکه برسی... لەناو شەوی چەوساندنەوە تازەبووکە

ـدگا وتی: بەپێی بڕگەی زاوای دزی تاوانباری

ـبسا وتی: تۆی تاوانبار

بەپێی بڕگەی زاوای دزی تاوانباری

دایکە برسی. لەناو شەوی چەوساندنەوە تازەبووکە

مـیش وتم: شەقڵەی لێدان

لەکەلاوەی ئازاردانا.. چەند بەهێز بێ. هەر چرووکە

هەر چرووکە

١٩٧٧/١٠/٣

# بۆ شاسواری... سواری ئەسپی هەتاو بووە

**بۆ هاوڕێی شەهیدم، شاسوار**

وەک هێزێکی، رژاو بەناو گیرفانی بۆرجوازییەکان
وەک (بێگاری.. دەرەبەرگیی) گڕ دەتکێنێ
بەدەروونی جوتیارەکان
وەکو پووشی، لەناو بڵێسەی ئاگردان
وەک ئەوانە.. خوێنەکانمان، دەبن بەداس
مافی دۆڕاو دەدرونەوە
خوێنەکانمان.. دەبنە هەسان، خەنجەرو شیر دەسوونەوە
هێزی شەپۆلەکان دەڕۆن
رەنگی زامی هەرچی سنووری دەستکردە
لەکەناری راپەڕینا، دەریا دەخۆن

* * *

من دەمەوێ، کرێکاری کارگەی شیعر وتنێ بم

خۆم خاوەنی (کەرەستەی خاو، هێزی بەرهەمهێنان)ـم بم

هێزو بیرو، وشەو زمان.. رقی چەوساندنەوەی ژیان

لەمیهرەجانی برسێتیم

هەر خۆم شیعری تێکۆشانم بخوێنمەوە

هەر خۆم بەفری سەرمایەدار، بتوێنمەوە

من دەمەوێ شیعرێ بڵێم رووناکی بێ

بەدەست شاسواری بەربەریان

من دەمەوێ شیعرێ بلێم، زۆر لەشیعر گەورەتر بێ‌و

شۆڕشێ بێ بۆ گۆڕینی (خەو بۆ هەڵسان، شەو بۆ بەیان)

شۆڕشێ بێ، بۆ گۆڕینی هاتنە سەرکاری هەژاران

من دەمەوێ شیعرێ بڵێم یاسایێ بێ

بەدەست شاسواری شۆڕشڤان

من دەمەوێ شیعرێ بڵێم، زۆر لەشیعر گەورەتر بێ

کوتەیەکی بێ بۆ گۆڕینی یاسای ژیان

*   *   *

لەخەو هەڵسن، تەکان بدەن

ئەی کرێکاری رووی زەمین

تاکەی هێزو ئارەقەی بازووی کڕاوتان

چەکی سەرمایەداران بێ‌و.. لەوڵاتانی ژێردەستە

برامان پێ لەناوبەرن

دەی ڕاپەڕن

هاتین، هایتن هەموو هاتین

تەکان بدەن، ئێوەش وەرن

*        *        *

کاکە شاسوار.. لەگەڵ برینەکانی تۆ دەژیم

برای عاشق، تەکان بدە

لەناو هەموو دەریایەکی قەدەغەدا

پاپۆڕێکی‌و.. سامی چەکی نەتۆم دەگری

لەناو هەموو لووتکەیەکی یاساخ کراو سەنگەرێکی

لەناو هەموو گوندی ژانا ئاگرێکی

خۆت گوللەیت‌و.. دوژمن لەزامی تۆ دەمرن

*        *        *

برای عائق تەکان بدە

لەجەژنی لەدایکبوونتا

پارچە گۆشتی ئەمرۆکەمان دەبەخشنەوە

لەشەوانی بەراتمانا، داڵو بۆمبا

ژیان کوژ دەنیشنەوە

لەڕۆژی لەدایکبوونما.. کێردی دەستی بورجواکان

دەیانەوێ چیاکانمان سەر ببڕن

دەیانەوێ سامانی ناو کێڵگەکانمان. بگریەنن

دڵو مێشکی هەڵبدڕن

* * *

برای عاشق... کاتی کەسواری خۆر دەبیت

سەدان سوارت لەگەڵدایە

کاتی کەسواری خۆر دەبیت رووناکی ئەستێرەکانی

ئاسمانی نەوبەهارانت لەگەڵدایە

برای عاشق

کاتێ کەسواری خۆر دەبیت. هەرچی فرۆکەی دوژمنە
هەر لەفرگەیدا دەمریت‌و قورئانی مردن دەخوێنێ
کاتێ سواری خۆر دەبیت، (دەنگی خۆشت)
لاوک‌و حەیرانی هەژاران، دەهێنێت‌و
تەقەی زۆردار دەوەستێنێ
کاتێ کەسواری خۆر دەبی. ئەستێرەکان لەشکری تۆن
لەنۆتەکی شەوی سەردەم، لەهاتوچۆن

* * *

کەکە شاسوار.. تەپەی ئەسپ
لەدوێنێوە، سامی تاریکی نیوە شەو. پێی زانیوە
تەکان بدە
دەستگیرانت، کەمانێکەو سازی بۆ گیانی تۆنیە
دەستگیرانت سەنگەرێکەو دڵداری خۆی تێدانییە
دەستگیرانت ئاگرێکە
هێشتا تیشکی لێمان دوورە

تەکان بدە.. وادەبینم

زین‌و لغاوی ئەسپەکەت.. لەخوێن سوورە

کاکە شاسوار.. ئێمەش سواری ئەسپی تۆین‌و..

راوی دوژمنەکانی تۆ دەکەین

هەرچی دوژمن پێی ناخۆشە.. مەوا دەکەین

شەو یاسا بێ، ئێمە رۆژین

لەکوردستان، چیا لێمان قەدەغە بێ

لەجێی شەماڵ تیا دەژین‌و خۆمان لوتکەین

ئەگەر مردن، دەستبێن، لەشوانکارە بگرێ

ئێمە هەناسەی بۆن خۆشی بەرزی ژینین

ئەگەر خەوتن لەناو بێشکەی دیلێتیدا

لای لایەی زامی ئێمە بێ

ئێمە هەرگیز راپەڕینین

١٩٧٨/٢/٢٠

# ئەو نووسەرانەی
# دەروونیان چاڵی بەفرە

(بەبۆنەی بەستنی پێنجەمین کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کورد لەهەولێر بەسترا.. هەڵبەتە هەموو نوسەرێك ناگرێتەوە..)

یەک، دوو، سێ چەند ئاسانە

تفی سەر شۆڕی دەژمێرێ و.. وشەی دەمی وەک هەناسە

گەڕان.. گەڕان، لەکۆلانا..

لەشارەکانی خۆمانا..

تا.. (بژی)و (با)ی تیا بنووسن

هەرچی گڕە..

هەرچی دارستانی چڕە

بەسۆپەرمانی عەنتیکە

دەیانەوێ شاخ و دۆلیش، داپەڵۆسن

*

ساڵ ژماردن، پووڵ ژماردن، زۆر ئاسانە

تفی سەر شۆڕی بژمێرن!

وشەی داسی دۆرکانتان، وەک هەناسە

چاوی رستەکانی ئێوە، کەم بینایە

تانەی ترسنۆکی تیایە

گیرفانی وشەی کۆنگرەتان

وەک گیرفانی (بەرخۆکە)ی[1] شێت پێرار، برا

وەک جەڵەبی یاسادانانی (ئاغەکان) بەشەو کرا

شەهید (شەهاب) جەعفەر، ئەنوەر

عوسمان گرو، مەجید کەریم[2] وەستا ئەنوەر

کرێکاری کارگەی هەولێر

---

[1] بەرخۆکە: شێتێکی مناڵ پەروەربوو، پارەیەکی زۆری هەبوو، رووتیان دەکرد.

[2] مەجید کەریم: شەهیدێکە لەکاتی نووسینی ئەم شیعرە، شەهید نەکرابوو بەڵام لەکاتی نووسینەوەی ئەم دواییەی شیعرەکە، خرایە سەر.

جوتیارانی دێهاتی پڕ لەخێرو بێر
چاوی ئێوە، نایان بێنێ
لەکونجی گەرمی زیندانا، لەکوشتن‌و تێهەڵدانا
وشە کوێرەکانی ئێوە.. نایان بینێ.
*
پەت‌و سەکۆی سێدارەکان
بۆتە یانەی ئێوارەی ژینی لاوەکان
لەسەعاتێ هەزاران جار..
(سۆندە)ی کێبڵ بن پێی خوێناوی ماچ دەکا
دادی زللە، قژی مێوژمان قاچ دەکا
ئەدیبەکان..
وشەی ترسنۆکی ئێوە.. ئەم دەنگانەمان نابینێ
لەخوێن، لەگڕ، لەلافاوی چەوساوەکانا، دەترسێ
ئەگەر دەیان کۆنگرە بگرن
بەری خۆری زامەکانی هەژار ناگرن
*

بڕیارەکانی کۆنگرەتان

داسی کولی (سالحاغە)یە[٤]..

ملپێچی (رەش)ی لەملەو. بەفیکەێی لەحەیرانە

بڕیارەکانی کۆنگرەتان..

(حەمە رەزا)ی[٥] شێت نابینێ.

کاتێ کەپێی ئەڵێن (دەروێش). بەشی هاوارو گریانە

زامەکانی.. هی (چوارچرا)ی گۆڕستانە.

*

ئەدیبەکان..

داوی وشەی کۆنگرەکەتان..

گەر چۆڵەکە بۆ شازادەی پاشا نەگرێ

---

(٤) سالحاغە: بەناو شیتێکە گاڵتە بەشارستانییەت دەکات، لەشەقامەکانی هەولێرا داسێکی بەشانەوەیە. بەگوێرەی باری ڕۆژ زۆر بلێیی دەکات.

(٥) حەمە رەزا: کۆنە ئەفسەرێکی سەردەمی (قازی محەمەد) لەداخی هەرەسهێنانی کۆماری مەهاباد تێك چووەو خۆی بەدەروێشی (قازی) دازانێ.

ڕەوە کۆتری سەربڕاو

بەدیاری بۆگیرفان نەبرێ..

نابێ..! نابێ!!

ئەگەر درۆی هەموو دنیا. بکەن بەبلوێری حیزی بلوێر ژەنێ

نانی (کانە)تان[٦] نادەنێ..

١٩٧٨/٧/٣٠

---

[٦] کانە: ئەم جار جارە خواردنەیە کە لەبەندیخانە دەیدەن.

# سەرداننی بەندیخانەم

وتیان: برا خەمت نەبێ.. بەندکراوی
لەخەمی دووری ئالاوی
وتیان گیانە: بەردەبیتو لێوی زامەکانی گیانت
ماچی خۆڵی ولات دەکات
گڕی دووریت، بەردەبێتە شەوانی ساردی ژیانت
وتیان: برا، بەندیخانەی تۆ خۆشترە
رقی هەتاوی ئارەزووت، گەرمو توندو بەجۆشترە
وتیان: ئێمەش لەبەندیخانەدا دەژین
هەوای سەربەستی نامژین
وتم: دەبا وەکو ئێوە بەرەڵلابم
وەکو هەتاو.. لەماڵی شۆڕش زاوابم

جا بائێمە تەنها رۆژی، بەئارەزووی خۆم ئاوابم
دەبا ببمە تفەگێک‌و لەدەست منالّی ساوابم
بەرەڵلاّبم
وەکو هەتاو لەماڵی شۆڕش زاوابم
دەبا ببمە (نیزەکێک‌و) هەموو دەشتی کوردستانمان بسووتێنم
خۆ دەتبینم خۆشەویستم هۆگر دەبێ‌و
لەکەژاوەی هیوامانما.. دەی هەژێنم

١٩٧٨/٨/٢

# سوپای
# بنکە سوورەکان

جوتیارەکان... جوتیارەکان

سەرمامانە..

سەرمامانە.. بائاگرێک بکەینەوە

برسیمانە.

برسیمانە.. بامناڵان ژیرکەینەوە

ڕێمانبدەن

با تفەنگەکان تەڕنەبن

ئەگەر جوێنیشمان پێبدەن..

ئێوە تووشی شەڕ هەر دەبن.

*

جوتیارەکان.. سەرمامانە..

داڵدەماندەن.. خوێنی خۆمان ئاگرمانە

دالدەماندەن برسیمانە

گڕی چاوی دەشتی ئێوە.. لوقمەی دەمی شۆڕشمانە

لابردنی ماکی دوژمن.. کۆششمانە..

جوتیارەکان.. ڕێگەماندەن..

کۆتری سپیی جوانمان پێیە

وەکو چەتری بەفری ئێوە، هەڵمانداوە

دەژین، دەژین

لەگەڵ گڕی.. لەبننەهاتووی ئەم ڕێیە

*

سەرمانانە.. بەم زستانە..

برسیمانە..

سەرمامانبووو برسێتیمان

کردوونی بەدسکەلای قوربانی هەژار

وچان نادەین

تادەرەبەگ، دێتە ژێر بار

وچان نادەین.. تابرسێتی ناهێڵین و

دێکەی ئێوەش، دەکەین بەشار

جوتیارەکان..

بستێ زەوی، کێڵگەکانتان، وەکو لاستیک

لەدارلاستیکێ ئالآوە

ئێمەی گوللە، بەردێکی ناو چەرمی ئەوین

هەندەت زانی..

داڵ و قەلی گەنکەکانتان پێکاوە.

جوتیارەکان..

تینومانەو.. بارانی ساڵی نەهاتین

سەرمامانەو.. خۆری گەرمی، بەهاری ناو زەوی لاتین

برسیمانەو خۆمان نانین

چەمی گرین.. کانی ژانین

داڵدەمان.. دەستمان دامێنی زامتان بێ

مەترسن نابێ، خەمتان بێ

بۆتان دەبێنە جۆگەلەو، زەوییەکانتان بۆ ئاو دەدەین

بۆتان دەبینە ئامێرو..

لەگەڵ لوولەی چەکەکانمان، جاڕی شۆڕشی تیا تاو دەدەین

داڵدەماندەن.. تارەشماڵی برسێتیمان..

لەگوندەکانتان هەڵبدەین

جوتیارەکان.. لەکوێ خەوتوون.

کەباسی سەربەستی دەکرێ.

ئەحەی کورنۆم دێتەوە بیر

لەتەک ئەوا کەناوی شۆڕشیش دەبرێ

پێڵاوەکەی ئەحەی کورنۆم دێتە بەرچاو..

کەچۆن دەبێتە نوێنەرو.. وەزیر

١٩٧٨/٦/٢٠

# ئەو بایەنیم

تەنها ژووری هلمژی

ئای لەو دڵەی کەوەرزش لەگۆڕەپانی سنگت دەکا

ئای لەو چاوەی، لەپێشبڕێکی تیشکی خۆرا.

ئەوی دووریم دەگرێنیّو.. ئاگر تێکەڵ دەنگت دەکا

*

گیانە ئەگەر  با بوومایەو بەند بکرابام

خۆ نەبدەووم هەناسەی خۆبادانی شەقاەکان

نەدەبووم بەئۆکسجینو..

گڕ خۆشکەری، سەهۆڵ بەندی تەلارەکان

(با) بوومایەو..

دەنووک سووری، ناو سییەکانی هەژار نەبام

ماڵ نەدەبووم.

وا بوومایە.گەمی سوورەکانی عیراقم پاڵدەدا لەدیجلە ژان

بەرەو لوتکە سەرنەکەوتبام

پێڵووی چاوی گەل نەدەبووم.

من ئەو بایەم.. شەماڵەکەم، لەناو کەلی کێوەکان

پڕاوپڕی دڵ ڕژاوە

تەنها گیانە.. گەردەلوولو زرِیانەکەم، بەندکراوە

١٩٧٩/١/١

# ڕۆژی
# لەدایکبوونم

زۆر نووسرا بوو..

ژان، بیرە نەوتی دەروونە

خەم، گرێکە، لەهەڵچوونە

زۆر نووسرا بوو..

شاریێ گیرا.. زۆرکەس کوژرا

بۆمبا تەقی.. بەناو هەوری قرچەی گەرما

زۆرمان دەبیست، مافلا مرۆڤ

واتە لێدان..

سزا زیندان.

زۆرمان دەبیست، شۆڕش شۆڕش

شۆڕش لەناو.. خوڕەو شەپۆلی ئارەقەی کرێکاران

زۆرمان دەبیست، فاشست، نازی

هێرۆشیماه ئەتۆم بازی.

تازانی سوور فێری خویچندەواری کردین

خوێندمانەوە

چەوسانەوە

خوێندمانەوە

نان و ولات و ژێردەستی

خوێندمانەوە.. خەبات، سۆشیالیست، سەربەستی

لەفێرگەی شەو نووسین فێربووین

تانووسیمان..

(چەکی چاوی مێشکی هەژار)

بارگەی شەپۆلی رووبارین

گردو کۆری گشت تەلانێکین.. هاتووین بەغار

لەشاخی سوور، گردۆڵکەی رەش، نووسیومانە

لوسووتانی خۆمان گڕین

لەناو لوولەی ویستی برسی،گوللەی دڕین

تافێری نووسینی ئەم وێنانە نەبووم

هێشتا نەبووم.

کەفێری بووم.. لەدایک بووم.

١٩٧٩/١/٢٥

# بەیادی تاڤگە سوورەکە

(بەبۆنەی تێپەڕبوونی سالێ بەسەر شەهیدبوونی. شەهاب، جەعفەر، ئەنوەر)

سالێ رۆیی‌و سێ چاو... ئاگر دەگرن

سالی دەبێ.. دالی خنکان بەخوێنی لاشەیەان دەمرن

بیناهیان.. بێدەنگ نابێ

زامەکانیان.. ناگریەن‌و بازووی چەکیان ، دڵتەنگ نابێ

ئەی چاوەکان.... لەبیرمانن

دەژن. دەژین، لەناو لوولەو ژێی تیرمانن

گوێمان لێبوو.. هاواری خۆشەویستیتان

وەکو خۆر چۆن‌و داناگیرێ‌و تیشکەکانی، هەر دەبەخشێ

ئێوەن ئەوەو.. بەرەو سەرمای چیاکان دەکشێ

بتەقنەوەو هاوار لەفاشی هەڵسێنن

یواتان بوو بەگەرووی خۆراگرتنتان

پەتی سێدارە بپسێنن

*　*　*

ئەی چاوەکان

وەک چۆن گەرمی گیانی گڕە

ئاوی پەڵە، لەناو کێڵگەو رەگی رووەک، سۆزی کرە

لەبیرمانن، فیشەکدانمان لەرێبازی ئێوە پڕە

لەزستانا، چەند پێویستمان بەجلی گەرمو ئەستوورە

زامی ئێوە، چەند لەبازوووی لەبیرچوونی ئێمە دوورە

لەبیرمانن، دڵمان لەناو دڵتان سوورە

* * *

ئەی چاوەکان.. پار ئەم کاتە.. سەنگەری گرتان داکوتاو

(کەڵ ژیانو کەمیش ژیان)

پار لەم شوێنە... وشەکانتان، تەرمەکانتان

وەکو تاقگە... رژانە کەندانی برسیو رقی جیهان

* * *

هۆ چاوەکان

داسەکانتان، دایە دەستی حەزی سەپان

تا تەبارەی ملی خوێن مژ.. بسڕنەوە

تاخەرمانی داگیرکراو

بەئارەقەی جوتیارەکان بکرێتەوە

ئەو چەکوشەی نیشانتاندااین

بزمار دەکتێو

لەکارگەکان لای کرێکاری دڵدارە

ئەمڕۆ هەرچی هەڵوێستێکە.. لەوان بارە

سەری دوژن وردو خاشەو

هەرچی قەڵەوی قەد کێوە، لەهاوارە

*        *        *

ئەی چاوەکان

ساڵێ ڕۆیی و.. تیشکەکانتان، ئاگر دەگرن

داڵی خنکان بەتۆوی لاشەتان دەمرن

زۆر چاوی تر... بۆ بارەگای ئێوە دێن و

بڕیاری سەربەرزی دەدەن

لەخاکی گڕ تێبەربوا، بەرماڵی شۆڕش رادەخەن

زۆر گیانی تر

تەرمەکانتان ماچ دەکەن و دەبتە پردی بەرەو بەیان

لافاوی ورناکی زۆر چاو

میوانی ماڵی هەژارە، بۆ خواستنی یەک دەستگیران

١٩٧٧/١١/٢١

# ئەو کتێبەی،
# وشەی بەخەنجەر نووسراوە

کەم ژیان و کەڵ ژیان

ریزە چیاکان..

وەکو تەونی بەرەبەیان.. راچەندرا بوون

برۆی روناکی چاوی خۆر..

وەکو ریسی مافووری دەستی قەیرە کچ

بەگوڵاڵەی باڵای لاوی رایەڵ کرابوون

*

لەنێو، جوت مەمکی ووکەلا.. لەدەربەندی

ژانی دایکم.. راوی نام و..

وەکو تەورداس، کوێرایی تاریکیم بڕی

بومە رووبار، خۆم هاویشتە هاژەی کەندێ

*

هاتم هاتم..

ناویان لێنام داسی سەپان

ماچی گوڵی گەنمی تەبارەم دەکرو..

کەدەمبری..

تنۆکی زیزبوونیم بۆ دەسڕی..

لەجۆخینا.. قەدو گەڵای (گەنمە سوورە)

بادەیبرد بۆ.. هەر هەڵەتێ زەقو دوورە.

خێرا ئاغە

رەوسەو دانی، لەعەمارا هەڵدەلووشی

وەک شۆخی بەزۆر مارەکراو

خەنجەر، ئاگر لەڕێگا دەبوو بەتووشی

*

پۆستەی خەرمان بەرە کەرتیی جوتیارەکان

لێی نووسرابوو، گەنمە سوورە، هاوار.. بۆ (داس)

کەی پەیمانی.. گەوزە برسێتیمان وابوو

*

هاتم، هاتم.. ناویان لێنام (مامە سوارە)

عەشقی کچی زۆرداری بووم

لەبەندەری دڵداریما..

ئێشکگری (ئاڵو وێڵی) هەژاری بووم

ئەسپێ نەبوو.. کچی ئاگر، لەپاوانی ئەڤینی زوو

لەگەڵ منە تاوی تێدا.

تاگەواڵەی، شوانکارەی شەپۆلەکانم

هەڵیگرت و هیچنای، هێنای بەرێی نوێدا

لەگەڵ منا تاوی تیا.

*

هاتم، هاتم.. ناویان لێنام (ئاگرە سوورە)
بوومە کلیل.. بۆ کێڵانی هەر کێڵگەیەک
دەرگەی جوتی.. جوتیار نەبێ نەیکاتەوە
بوومە خورشت.. بەربوومە گیانی دەوڵەمەند
تاقورقوشمی نەڕژێتە سەر
چاری نابێو.. خەوی مردن دەیباتەوە
ناویان لێنام ئاگرە سوورە
بەقسەی رەق چوومە ژوانی
(هەڵبەت قسەی هەزار رەقە)
لێوی وشکو تاسەی گەرمی برسیو اینووەکانم هێنا
گڕی تاڤگەو خوێنی دوژمن، رووبارێ بوو
دەممان تێنا.. بکوژە ببڕە
پشکۆکانمان، هەندێ چزان
دوچمن شەوی بەسەرداهات
چاوی وێستانییەکانی مە..
نیشانی تەمەنیان، گرە.
*

هاتم، هاتم..

ناویان لێنام بزمار کوتە

چەکوشێ بووم

ئەو دارتاشەی، شەسکەمیلی ئەنجومەنی..

کۆشکی سپیی دروستدەکرد

ئاسنگەرێ کەشیش بەندی..

بەندیخانەی خوێنی (باستیل)ی خەستدەکرد

هێزی منی پێنەکرا

کەوی کێوی باوەڕی پێهەڵنەفرا.

١٩٧٨/٨/٣٠

# کاتێ هەژار
# قەفی سنوورەکان دەبڕێ

کۆمەڵە هۆنراوەیەکە زۆربەیان
لەبەندیخانە نووسراون

## سێ دیمەن

-١-

بەتریفەی مانگەشەوا
لەیادگاری تەلخی (ئەوا)
دڵ وەک تاڤگە بەخوڕ دەڕژا
دەڕژا بەناو سنگ و قڤا
وەکو تەمی پیچش دەم‌وچاو
ئێوارە بوو، (پەیمان) بەناو
خۆی پێی نایە بان ئەو جەرگەی
هی یادی رۆژی ئەو مەرگەی
کە ئاسمانی ویژدان گریا
گیانە..کەس نەهاتە فریا

-٢-

باڵندەی بن عەرد، بوون بەجیفڵقە

جەوەندەی ژێرزگ، زگی کەری دێز

مت بوو بێ شڵۆقە

ئەمیان پان بووە، ئەوەیان زۆر گریا

گریا، گریا..

گریا، بۆ بڕیا..!!

-٣-

جۆخینی ئاغەو جوتیاری ئەو دێ

ئاگرێکی گرت، تاکو سەر لەنوێ

هەریەکە بۆ خۆی ئارەق بڕێژێ

تەرمی چەوسێنەر.. ڕەنجبەر بینێژی

١٩٦٩

## وتەیەك

شیلەی دەروونی تەمەنی لاویم
خستە گۆمیلکەی خۆشەویستی تۆ
سەربوەتی[1] ژینی، دورر لەگەرداویم
کردە، تەرخانی جوان پەرستی تۆ
بۆیە هەر نەبێ رێز لەوەبگرە
لەپێناو نرخی بەدڵ تێکۆشە
ئەگەر جارجاریش پێم وتی: بمرە
کەبۆ بۆ تۆ وابووم، تۆش بڵێ خۆشە

١٩٦٩

---

[1] سەبوەت: ئارام. سەلیقە

## پیرۆزبایی!!

بۆئەو شۆخەی

بقسەی من عەباری فرشێ نەدا

دەک پیرۆزت بێ، ئەو کفنە رەشە

تیا ئەیشاریەوە، ئەونیگا گەشە

مردوو کفنێکی سپی دەپۆشی

بەڵام کچێ تۆ!

تۆ بەزیندوویی خۆ گیانت دەپێچی

ئەگەر سەرپۆشی

خۆشت دەرفرۆشی

کوا زیندووی..

مردووی!

ئەی بۆ سەرپێچی..

١٩٦٨

# چرپە

دڵی شەیدا..

لەباوەش سۆزی بادا

خستمە سواڵ

گەردان بەدوای جوانی کەژاڵ

وەک هەڵگری تورەگەی راز

پشتم سوار

هەژار، رسوا

چەند هەوار گەو زۆر پێچمکرد

تابیگورمەوە بەمراز

لەپڕ کولی گرانم سوک بوو

نەما ماندووبوونی پیشوو

تومەز جوانێک، منی دواند

خەمی دڵی منی هەژاند.

١٩٦٩

# فرمێسکێ

(بۆ ئەو کیژە فەلەیەکە وتی:

بۆ: نابێ منت خۆشبوێ!!)

لەئاسۆی چاوی پرشنگدار

لەئاواتی گەش‌و دیار

لەدوو لێوی تەڕی دواماچ

لەجووت مەمکا لەسەریا (خاچ)

کە هەڵبەزی بەسەریانا

خۆی موچڕکە لەناوگیانا

لەدڵ‌و چاوی شارماوی

کەبۆ دڵخوازی داماوی

هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ

دوور دەستگیران. جەرگی دێشێ

لەئەندێشەی دڵی پڕ سۆز
کە کەوتۆتە نێو تەپ و تۆز
ئالەوانە..و لەهەموویان
بۆ یادی خۆش، کۆڕی ژیان
وا دڵ دەگری، بەبێ ئۆقرە
جارجار جەستەم دەمد تەفرە
زۆر دڵۆپی خۆشەویستی
خۆشەویستی کەس نەبیستی
هەڵدەڕێژی بۆ جۆگەم
تاڕاماڵکا، درکی ستەم
ئەگەر گیانە.. هاتنە لای تۆم بێترس بێ
ماچی کولم و لێوی ژیان.. بیبێ پرس بێ
کاتێ کەتۆ
باڵت گرت بۆ گەشتی ئاسۆ

کاتێ وتت:

باسەربەست بم منیش بۆ خۆ

ئەوسا گیانە.. زۆر بەهیوام

رزگار دەبین

لەکۆشی گەرمی یەکسانی

دەس لەمل یەک..

لەژیانا، بەختیا دەبین

١٩٦٩

# وازبێنە

کیژۆڵەکەی شارستانی

دەستگیرانی، منی لادێی کوردستانی

تۆ وازبێنە، لەژیانی بورجوازیت

لەبیرت چوو خۆشەویستم

لەبیرت چوو

وتەی ناخی هەژار خوازیت؟

دەوازبێنە

لەئاڵۆزی بیری دەوێنێ

لەو گۆرانییەی، هەستی زیندووم دەگرێنێ

دەوازبێتە

لەئەندێشەی کۆشکـو تەلار

لەنازی نێو، جانتای دینار

دەوازبێتە، دەوازبێنە

١٩٦٩

# لەئاهەنگا

تیشکی روویتۆ ماچی کردم

لەهۆڵی ئاهەنگی نازا

بەرەو شانۆی چەندین چاوی

وەک تۆی بردم

خستمیە شەڕ لەگەڵ نیازا

لەجووڵەی لێو، تێت گەیشتم

نامەت دەوێ

تامەبەستی هەردوکمانی

تیا دەرکەوێ.

*

لەباتی نامەی پڕ گومان
خۆم هاتمە لات..
بەپەنجەی خەم بەزەنگی مات
لەدەرگامدا
لەدەرگەی زامی نەترسا
کەتۆم بینی
رزگارم بوو..
لەژێر بارێکی زۆر قورسا
*
کە هاتمە لات..
بازێک بەسەرما نیشتەوە
بوومە سەرکردەی دەوڵەتی خۆشەویستیت
لەسەر تاخچەی هەردوو مەمکی
کەس نەویستیت
لێی دانیشتم
بەئامانجی گیان گەیشتم

١٩٧٠

-لە(ژین) لەژمارە (٧٠) بڵاوکراوەتەوە

# لەهەگبەی شارا

(ئەو هەستانەی سبەینان زوو لەمەیدانی کرێکارانی هەولێر دەبیسترێت)

دەنگت تێرە..

لەیارەگا، سەردەرێنە

بۆ شار بۆ دێ.. زۆر بۆ ئێرە

چاک بڕوانە،نەخۆشخانەی شاری کوێران

شاڵو کوێران..

تێبگە لەپژمەو ناڵەی

ئەو ژیانە یەکجار تاڵەی

تەشەنەی زام لەدڵ ژوورا.

لەئاگری نێو تەنوورا

دەنگی برسی

کەس نای پرسی

*

دەگوێت لێبێ..
لەتۆماری.. یەکجار زۆری ئەو دەنگانە
لەو ئاوازە، ترسێنەرە بەسەنگانە
دەڵێن: کوانێ کارگەی گران!
کوا خواردنێ.. نرخی هەرزان؟!
بێئیشین، ئیش
کوا ئیش، کوا نان؟
چی بەسەر هات، وەک یەک ژیان
*
لەناو نوشتەی هەڵواسراوی ئۆتۆمبێلا
لەچاوزار، خۆیان پاراست!!
لەموفەڕکی سەر کڵاوی کوڕی گێلا
کوڕیان پاراست
بەختی کوردیان

•

لەجۆلانەی، گۆڕی پیاو چاکا هەژاند

چەوسێنەران..

لەناڵی بەردەرگەی تەلار

چاوی گەلیان..

بەپوول دەڕواند.

*

چاوەڕوانی.. بارێکی ئاوی سوورین

زۆر پێویستین

لەداگیرکەرمان نابوورین

تاشەتڵەکانی رزگاری، یەک یەک دەڕوێ

جوتیاری دێی کوردستانم

سەربەست دەوێ

١٩٧٠/٩/٢٠

# تارەقەی تورە

بڕوابکەن..

دوا دنەگوباس لەشارەکەم ڕاگەیەندرا

ناڵەی جوتیار..

هی کرێکار

بەگوێی مافا، چیپێندرا

دایکی دڵسۆز.. گریا،گریا..

لەگریانە..

بۆ تۆڵەی خۆیو ڕۆڵەکەی

باودێک هێرۆشیمای لەنێو گیانە

١٩٧٠/١٠/١٠

# سەرنجی هەڕەشەی چاو

خۆشەویستم

دوێ کە ئەونگوستیلەی ژینم،خستە پەنجەت

لەتارمایی نیگای کپو فیزو لەنجەت

پەیمانی مردن‌و ژینتلەگەڵ بەستم

کەچی گیانە..

پەنجەی هەتیو دوێنێکەم

لەچاوەڕێی

دیاری ئەنگوستیلەی دڵت

گەستم، گەستم

*

لەئەیلوولی، گیانی برسیی ئەمساڵمانا

گەڕاین بەدوای مووچەو نانا

لەسەردانی ئەمجارەمان

بەکامێرای، چاوی حەزی بێکاریمان

وێنەی ناخی ژیانمان گرت

جوتیارە بێزەوییەکانی، گوندی بیرمان

هاواریان کرد، عەردمان دەوێ

کارگەرە بێنانەکانی شاری (ژێر)مان

هێرشیان برد وتیان: کوا نان

لەشاری ژان

وتیان کوانێ سەربەست ژیان؟؟

١٩٧٠

# گۆرانییەکی
# خنکاو

هەڵگەڕام بەکێوی دڵتا

تا تۆم خۆشویست

گەڕام لەدوای رووی وەک گوڵتا

تابەدیلی ناوی تۆم بیست

*

خنکاوی چاوی گیانی تۆم

توامەوە لەئارەقەت

بۆ فریشەی یاد خەم دەخۆم

بۆ سێبەری مێژووی لەت لەت

*

گیانی شیرین..

لەبازاڕی هەستی ڕەشا

مەزات دەکرای

بەقەپاری گازی دینار.. لەباوەشا

لەژێر بەزەیی جامبازدا

دەبرای، دەخورای

*

کەباڵیۆزی خۆشەویستیم، ناردە چاوت

لەخۆری ویژدان خۆم بینی

لەسەرمایەی بڕوای بتەو

نووسیم ناوت.. نووسیم ناوت

هەڵمهێنا چاوی گەشی ڕۆژێکی نەو

*

گیانە گیانە.. بڕوات بێ

تۆ ئاوازی خۆشەویستی ڕەنجی تاڵی

لەباتی خەم.. باشییت بێ

تۆبەرهەمی سرودێکی وشەی قاڵی

١٩٧١

# لەپەنجەرەی دەرس وتنەوما

بۆ ئەو کچە مامۆستایەی خۆشەویستی منی

لێبوو بە کۆترێك‌و بۆی نەگیرا.. لە (باتاس)

نەورۆزیش هات..

شانۆی هەستم کرایەوە

بەفری زستانی ئازارم، لەاوەشتا توایەوە

ڕووناکی چاوەکانی تۆ.. گڕی هەستی داگیرساندم

خۆشەویستم..

لەبەیاری خوشک‌و برادا، بەدڵ چاندم

*

گیانە.. کاتێ دەیبیستمەوە

یاکە جارجار.. هەناسەی ژووری پۆلەکەم گیان سرِدەکا

ئاوازی نیازی دوێنێکە، گوێ پڕدەکا

لەچی، لەچی؟

لەجامی خۆشەویستی من

لەپاکیو جوان پەرستی من

*

لەچیرۆکە ئەفسانەکەی شانۆی لادێ

دڵی شێتی منیان رتکرد

لە (قورئانا)، لە (ئینجیلا)، لەدەشتێکا

هەزاران جار، ناوی خوا دێ

سەیر نییە... لەفەرهەنگی گوندەکەشمان

بەچاک بەخراپ

لەبارەی تۆ، ناوی من بێ.

*

خوشکی بەڕێز..

ئەو ئاوازە ناسازانەی کە گوێت لێیە

پێبیلکەی خۆ هەڵکێشانی چەند کەسانە

لەناو تەیارەی کۆمەڵا

داسی کولیان بێهەسانە

هەمدیس بەڵگەی

سەربەرزێتی مانیان، پێیە.

*

کەی خۆی هەڵدێ لەچاوی تۆ

کەی بیابانی من ماچ دەکا

کەی ڕێی دووری دڵم دەبڕێ

دەڕوا.. دەڕوا بەرەو ئاسۆ

کەی تینوێتی..

گەرووی ژینی من ماچ دەکا

١٩٧٢/٣/١٠ هەریر

# بۆ ئومیدێ

(لەنازێکیا.. لەکۆچ کردنیا، لەشوکردنیا، لەوسێ‌جارا، بزوامدمی...)

گیانە، گیانە..

بەهەناسەی پڕ لەهیوات

لەئاسمانی گیانی تۆدا..

وەک باڵۆنی خۆشەویستی، بەباڵ کەوتم

لەگەڵ نازو حەزی گەرمت

بەکارەبای جوولەی مەمکت

لەناو بێشکەی چاوت خەوتم

*

گیانە ئافرەت..

کەنامەی ئاگرینی تۆ

بەفووی دینار کوژایەوە

کە فرمێسکی یادگاری بێچارەییم رژایەوە

بەفری سەفینم رشتە نێو باوەش تۆ

وتم دڵسارد.. دەی تێر بخۆ

*

کەپیرۆزباییم لێکردی..

ئەنگوستیلەو کاتژمێرە بچکۆڵەکەت

وەک خەم ژمێر وەردەگێڕا

ئەوکاتە بوو.. دەستت بەناو جەرگم گێڕا.

*

خۆ دەزانم..

ئێستاش چاوی پەشیمانیت لەگریانە

بەڵام چی بکەین، چی بکەین گیانە

نەتزانیوە •

(لەجێی[1] قوزەڵقورت، سندانە)

هەریر ۱۹۷۰

[1] پەندێکی ناوچەی هەولێرە.

## ئاگر لەخەمی
## دووری بەردەبێ

خۆشەویستم.. کەجێتهێشتم
رووباری چاو.. بۆ هەورازی گریان دەچوو
کەجێتهێشتم
تەپەی هەنگاوی ناو دڵت
لەناو رەشماڵی تنەیاییم
بۆ ئێوارەی ژیان دەچوو
خۆشەویستم.. بۆ جێتهێشتم
منم گیانە.. مەچەکی خۆشەویستی تۆم
لەزیندانی دووری رووتا.. بەستراوەیە
بەگرتنم.. شایی بەفرەو..
وادەزانێ بەدەم خۆرا حەساوەیە.
بۆ نازانن.. قورگی زامی تێکۆشەران
شەیدای کانی ئەو چاوەیە

چەند دووریش بم.. لێم نزیکە..

قژی سپیو پیرێتیمی لافەریکە

خۆویستم، کەجێتهێشتم

وەک گوڵی بەرشەماڵی غەریبی گەل

لەناو باخی جێهێشتنما

هەناسەی بۆنی پەرۆشی

لەئیینجانی دڵما، جما

*

کەجێتهێشتم..

نەمدەزانی گەڕانەوەت، گریانێکە.

جیا بوونەوەی

(هەناسەوسی) تاوانێکە

نەمدەزانی کام ئارەزوو

لەناو کۆشی دەربڕینما نقوم بکەم

کەجێتهێشتم

نەمدەزانی.. چۆن زیندانی چەوسێنەران

بەبەر زەبری ئەتۆم بخەم.

١٩٧٧/٨/٢٦

# لەبیرت چووم
## بۆ گۆرانی

لەبیرت چوو، لەبیرت چووم
لەبیرت چوو، سەردەمی زووم
خۆشەویستم، لەزیندانە
هەورێ.. سنووری گیانمانە.
خۆشەویستم، باڵاڕێ بوو
بەئاسمانی جوانی تۆدا تێپەڕ دەبوو
سۆزم تەکانی سوارێ بوو
لەفرمێسکی دەشتی روتا..
گوڵ تەڕ دەبوو..
کاتێ دەڕۆی.. کاروانی گڕ، لەڕێگایە
کاتێ دەڕۆی. دڵ خۆشەویستی تۆی تیایە
خەونەکانم، گوڵی گەنمی دڵداریە
چاوەکانم، گۆمی مەندەی بیزاریە
*

دوای چی دەڕۆی
دوای ئەوەی کە.. کەشتیت لەدەریام پەڕیەوە
دوای ئەوەی کە، فرمێسکی خۆتت سڕیەوە
ڕۆیشتیتو دڵسۆزیمت هەرزان کڕی
ڕۆیشتیتو جۆگەی گەنجێتیمت بڕی.
دوای چی دەڕۆی..
جێتهێشتمو..دووریت کردە دەستگیرانم
وەک مانگانە خەمت خستە دڵو گیانم

*

لەبیرت چووم..
لەهەناسەی نامەیەکیش، ناو نابەی
لەبیرت چووم..دیارە نایەی خەمم لابەی
لەبیرت چووم..
منیش وەکو ئاگر هەڵچووم
قەفی زەمانە دەپسێنم
ناوی ژیانی نوێ دەێنم

١٩٧٧/١١/١٤

# شیرین بوکە، بەستەی نەورۆزی بۆ دەڵێم

(بۆ مەزهەری خالقی گۆرانی بێژ)

زۆر جار مەلی غەریبی دڵ

لەسەر میلی رادیۆکەمدا هەڵدەنیشێو..

ئامۆزاگیان دەڵێتەوە.

لە(گیانو گیان)ی خالقیو..

هەراو هۆریای دەروونی من

لەنێو (رۆڵە. کۆرپەی شیرین...)

جۆگەی کەلی یادی گەرمم دەکرێتەوە

*

برا مەزهەر خۆ ناتناسم

لەدەربەندی گۆرانیتا بەتفەنگی تاسەت کاسم

گرشی دەنگت دۆستی دێرینی.هەستمە

بزەی سابلاخ.. سۆزی ئای ئای

دەستگیرانی گیانی گیانی..

(چوار چرایەو مەبەستمە.

*

منیش وەکو تۆ، وەک (وەفایی)

وەک عاشقێکی ئاسایی

چاوەڕێی شیرینم دەکەم

شیرینی من..

بەخولی دۆڵی رەشی چاو..

قژی زامی گوڵ دەڕێسێ
شلکەی رانیگیانی سەرمای پڕ لەژانی
لەتەونی شۆڕش دەپرسێ
بەتەشیی پێڵووی چیاکان
شیرین تیشکی خۆر دەڕێسێ
خەڵکی پۆشاکـو نان دەپرسێ
*
ئەی هونەرمەند..
گوندی گەرووی هەناسەی تۆ
لەقەدپاڵی چیای دڵی من.. ەسووتانە
گوڵەکانی.. باخی مەستی، سۆزی قوڵت
لەناوچەیکی غەریبیما.. بەندە لەنیوەی ئینجانە
کاکە مەزهەر..
چاوەڕێی کام تەشی رستن لەشیرینی دنەگت دەکەی
کام لای لایە دەهۆنیەوە
کامە گریان..
لەدایکی کۆرپە کوژراوا..دەسێنیەوە,
*

کاکە مەزهەر..

لەو شیرینەی کە خۆشمەوێ

چاوەڕێی کام تەشی رستنی لێبکەم!

دەمێک شیرین دەمناسێ

نازی چاوی لەئاگرۆکەی کاروانی رێگا ناکەوێ

دەمێکە شیرین دەمناسێ

تەشیی سوورو قژی گزنگی بۆ دەبەم

کاکە مەزهەر.. سەیرە باسی شیرین دەکەی

شیرین منو وەفایی شاعیر دەیناسین

خۆشمدەوێ.. ئەو دەزانێ

چ تەبارەی ئازارێکی داوەتە بەردەمی داسێ

شیرین تەنها من دەناسێ

*

کاکە مەزهەر..

لەناو گەلیی گەرووی تۆدا، گەر دەنگ دەبووم

لافاوی سووری بەهاران، نەبوومایە

لەرەی خوڕەی خۆم دەبڕی

لەکوێستانی گەرووی تۆدا.. گەر زستان بام

بەگڕی شوانکارەی هەژار..

فرمێسکی چیاکانم دەسڕی.

*

ئەی هونەرمەند.. لەهەڵسانی بەندەکانت

شیرین باوەشم پیا دەکاو..

هێشتا هەوری خۆشەویستیی..

بەسەر کێڵگەی غەریبی گیان ناباریوە

منیش لێرە.. باوەش لەشیرین دەگرمو..

هێشتا هێزی، دەست بەسەری دەنگی دوورم

لەبێتەلی (ئامۆزاگیان)..

لەتۆمارگەی (کەمەرەشل) نەمەییوە.

*

شیرینی من هەردوو کوڵمەکانی سوورە

بێریڤانی ژانی گوندی دەم سنوورە

بەرهەڵبێنەی چەرمی سەری شەهیدانە

مارەبڕی..رەزگاربوونی کوردستانە

١٩٧٨/٨/٩

# لەگەڵ زامەکانا دەژیم

تینووم بۆ ماچی جۆگەیێ

هەردوو لێوی نابێتە سەر لێوی برینی چەوساوە

برسیم بۆ ماچی کیلگەیێ

لێوی هەموو برسییەکانی تیا روابێ

خۆشەویستی..

قژی گەرمی هەزاران بووکـو زاوا بێ

*

لێوی گرم..

ماچی تووڕە بوونی دەوێ

ماچی هەنگاوی ئەو (گەلە منداڵانەی)

لەشەقامی شەنکاریا

تەرمی شەهیدان دەنێژن

موچڕکەکانی ئارەزووی برسی سبەیێ

دانەوێڵەی دۆستو دوژمن

لەجۆخینی ئەڵقەی بەرهەم

بەخۆڕاگرتن دەنێژن.

لێوی گرم..

ماچی منالآنی دەوێ

لێوی سووتاو..

باوەش دەگرێتە ئەو خۆرەی

لەسەر گۆڕی هەژارێکا تفەنگێکەو..

وەکو شۆڕش لەزام دەڕوێ

١٩٧٨/٢/١٤

# زامەکانمان بەبای (هەرە) فێنك نابێ

سوورِی پانکەی بنمیچی رق

زای ناودەنێ.. باوەشێنی گیانمان دەکا..

زام‌و سووتانمان تێدەگرێ‌و..

وای ناو دەنێ..

گوایە ئارەقی پێستی لەش

بەبای (هورِە) فێنک دەبێ

وای ناودەنێ..

کەجۆگەلەی رەنجی (ڤیتامین)و خوێنیش

هەر بە (با)ی ئەو وشک دەبێ.

دەزانی رووی کیژۆڵەکان بۆچی جوانن

وەک بەفرو خوێن..

چاوی گەشی بەربەیانن

بۆیە جوانن..

بەشەماڵی کوێستانی خۆشەویستی سوور

باوەشێنی گیانمان دەکەن

بۆیە نیانن..

شەپۆلی ئاواتی بەجۆش

لەسەوزایی دەم رووباران

باوەش دەگرنە تیشمی خۆر.. بەراوردی ژانیان دەکەن

کۆژۆڵەکان بۆیە جوانن..

فێری شنەی باوەشێنی قژی پەرشی قوڕ پێوانن.

*

کیژۆڵەکان.. بۆیە جوانن

نیگای ئاڵی بەربەیانن

بیدەستو پەنجەی بەخەنە

دروێنەی گازی خاو دەکەن

تەوری تیژن.. بەدەست گڕی گۆڕهەڵکەنە

کیژۆڵەکان.. بۆ یە جوانن

کێڵگەی چەوساوەیی هەژار

بەگاستی چاودەکێڵن.

مارەبڕی خۆشەویستی شۆڕشێکن

چەکوشو بیورو بێڵن

١٩٧٨/٧/١٧

# بەچکەی شەپۆلی ژانەکان

-١-

کاتێ کۆتر بەرز دەفڕێ.
ئەگەر تەقەشی پێوەنێن.. دەربەست نییە
گەر نیشتەوە
لەو هێلانەی بەچکەکانی تی خوراوە
سەربەست نییە.
بۆیە لەزامی هێلانەی قاچو دەنووکی ئاڵ دەبێ
هەرچی دژی داگرکەران
چەکهەڵنەگرێ.. دلای تاڵ دەبێ

-٢-

لەشەوی سک تێرەکانا..

خانوو بەرز، ملوانکەی تاریکی خەمە

منارەی خەو، مێزەری مردووی لێدەنێن

قوللەی بەیانیە برسییەکان

هێشتا وەستای گڕی کەمە

تاکو سوورە هەتاوی رۆژ

شەوی خەوی بەنجیخانە.. هەر ناهێڵێ و

تاڤگە خوڕەکانی بەهار..

هەرچی هێزی هەژار هەیە

لەڕووباری پرشەپۆلا.. لمی دوێنێ بەجێدێڵی

-٣-

کەوی کێوی.. لەم کێو بۆ ئەو کێو رادەکا
راوکەر بەدجوایا عەبدالّە
هەستی کلچۆڵ دەهۆنێتەوە
شمشاڵی خوێن...! فووی پیا دەکا
قاسپەی خرۆش، دەبێە ژان، گرمە، ناڵە
کە کەوتە ناو داوی رقی دوژمنانی.
لەبیر دەکا.. کڵپەی سەربەستی کوێستانی
گەر بەریدەن.. ماڵی دەبێو هەڵنافڕێسۆی ژێر دەستی
دەرنابڕێ
کەچی مەلی کێوی برسیی ژانی کولم
لەقەفەسی هەرای دوژمن کەوی نابێ
سەرم برن..
ئالای سووری کەلی (شاخ)م، نەوی نابێ

١٩٧٨/٧/١٣

# چاوی..
# تەری سۆزمە

(شیعری گۆرانی)

وەکو گوڵی.. قرتاوم لەچڵی باڵا
وەکـو رەنگی سوور..
تکامە ناو لۆچی ئاڵا..
گیانە، گیانە..
گڕی چاوکـ.. لەهێلانەی رووتا، کڕە
دڵم لەخۆشەویستی تۆی، ئازیز پڕە
خۆشەویستم
هەستی بەندم، بێگاری خەمو ئازارە
ورەم لەناو کێڵگەی دووریتا جوتیارە
دوای ئاوڕی تیشکی چاوت، دیلی کردم
زۆر لێکراون..
هەڵمەتی خێری پێ بردم.

گیانە گیانە

هۆ ژنە خۆشەویستەکەم

ئەیهێزی زنجیر پسێن و.. هەڵوێستەکەم

کە هاتیە لام..

گوڵی کوێستانم بۆ بێنە

گریەو هەرای مناڵەکانم بۆ بێنە

هۆ ژنە خۆشەویستەکەم

کەڕۆیشتی.. باراشی خەمی زیندانم

ببە بۆ ئاشی رووباری کێوەکانم

هەرچی گەنمی وڵات هەیە،بیکەنە نان

تاتێر ببێ،

زگی ئێمەو دڵدارەکان

١٩٧٨/٧/١٨

# خۆشەویستم
# ڤیتامینی مێژووی منە

خۆشەویستەکەم بێرییە

چارۆگەکەی هەولێرییە

دەستگیرانم بێری رەشماڵ نشینێکە

شوانکارەی گڕی ئەمساڵی

لەپووشانەی بەگ بێزارە

بێری، حەزی لەبازنە

حەزی لەمێخەکی یەخەی بەرینارە

*

خۆشەویستەکەم بێرییە

چارۆگەکەی هەوڵرییە

خۆشەویستم.. قەدپاڵێکە، لەکانیاوی غەریبیدا

برِی تێنوێتیم دەشکێنێ

شمشاڵی شوانێتی دێرین

لەپاڵەوانی یادو دوورا

بەقەپاری یادی دوورا

بەقەپاری پەزی برسی دەبزوێنێ

خۆشەویستەکەم بێرییە

گوانی خوێنین دادەدۆشێ

پسپۆری ماستی بەهارە

دێ نشینەو..

مارە برِی رەنجی شارە

١٩٧٧/١٠/١٥

# ڕاپەڕین

لەبازاڕا..
کەدیلیکیان، هەراج دکرد
ترس و سامی دابزڕکاو..
لەنیشتمان، لەژان پڕبو..
یەکسەر دەمرد..
هیچ گیرفانێ
نەیتوانی ئینسان بکڕێ
کەچی چرنۆکی ئەم (دیلە)..
توانی گەرووی خاوەنەکەی
گورج هەڵدڕێ.

١٩٧٨/٨/١١

# گڕی بورکانی کێوەکان

## (بۆ شەهید جەعفەر)

کەم مێژووە.. قۆناغەکانی زۆر گەشە

کام سپیو سوور پێست ڕەشە

کام کتێبخانەی وڵاتە

بەقەد مێشکی شۆڕشگێڕی، پڕ زانینە

کام ڕاپەڕین

بەقەد تینی زامخی کوڵی هاوڕێی مەرگ

تێرخەباتە..دڕولاتە..

مەگەر هەر بیری باوکێکە

شۆڕشی کوڕی دایکێکە

گریاوی بێشکەی ڕەنجبەرە

بۆ ڕزگاری چەوساوەکان

وەک سۆپەرە

بەرزی ئاسمان، قووڵی دەریا
تێکڕە شینن
ناگا بە( شینی)ی چاوی تێکۆشەر
شەکر، چوکلێت باقلاوە شیرینن.
ناگا بە شیرینی هەنگوینی خوێنی سەر
*
ڕەنگی (شین)م لەبیر ناچێ
چاوەکانی جەعفەر شین بوون
گەرمی هەتاومان لا ناچێ
هەنگاوە سوورەکانی ئەو..
هێزو تین بوون.

١٩٧٨/٨/١٠

# نێوان بەفرو ئاگر

کە لەدوای دوژمن ئالاّین
من‌و دوو کەس لێمان دەدرا
ئەوی راستەم کەلێیان دا..
وتی (گیانە، لەگەڵ ئێوەم.. بژی دوژمن)
ئەوی چەپم تا کوشتیان
دەیوت: زووکەن، خوبشمرم
لەخوێنی من.. لەجیاتی گوڵ تفەنگ دەڕوێ
گوللەی توڵەی..
کریکاران دەتان کوژن

١٩٧٨/٨/٢

# چەند گۆرانییە بۆ سەرەتا

(وەڵامی چەند پارچە شیعرێکی شاعیر لەتیف هەڵمەت کە بەناوی (چەند پارچە سەرەتایەك بۆ یەك گۆرانی) لەیەکێ لەژمارەکانی گۆڤاری رۆژی کوردستان بڵاوکرایەوە)

-١-

پێکەنین

ئێمە لجەرخێکدا دەژن

خەم: گریانو خوێن رشتنە

خەساندنی راپەڕینە..

ئەم سەدەیە..

سەدەی سووتانی خەرمانی داگیر کەرە

سەدەی زامی چەوسێنەرە

سەدەی نانە

نەدۆندرمە، نەئەسپرین

بۆ برسێتی هەژارەکان

نابن بەکۆلێرەو هەنگوین

لەچ دەرمانگەی ئەم سەدە

دەرمانی پێکەنین دەبێ

هەڵبەت، شۆڕش

میللەتی پێرزگار دەبێ

-٢-

رۆژنامە

رۆژنامەکان

ناتان خەمە، تەرازووی شایانی رەخنە

نەهەژارن،

نەبوێرن

نە، وەک ئێمە دڵتان لەزاما کون کونە

تابڵێین: ئەی رۆژنامەکان

نەتانوێرا.. بڵێن شای شار،دڕندەیە

بەرگی بەری..

ئارەقەو قینی ئەمگەلە پێوە دیارە

بۆ سبەینێ خۆی ناگرێ

لەبەر لافاوی ئەم رقە کوشندەیە

١٩٧٨/٦/١٩

# کاتێ مرۆڤ دەبێتە مادەیەکیتر

سەربازێک لەسوپای سوورا

گەر بگیرێ..

دەچێتەوە زگی دایکی

بەگوللەیەک..

ماچی دڵی خۆی دەکات‌و

لەپێناوی..گوڵ‌و زام‌و خوێن‌و خاکی.

١٩٧٨/٨/١٢

## کاتێ هەژار قەفی
## سنوورەکان دەبڕێ

تاسولێ بم بەپێی کچی دیهاتەکان
رووی داگیرکەر مجیاج بکا..
لەپاژنەما..
قوڕ بزمار، تفەنگی پێی بریندارن
مامزە کێوی دڵدارەکان
سنووری ئۆردوگای (ناتۆ) دەشکێنن و
چەکوش وەشێنی ئازارن
تاباخچەبم قەدم دیلی رەشەبابێ و..
زریان میوەم هەراج بکا..
رەگم وەکو رەگی لوتکە، دەکوتراوە
باخەوانم، وەکو دەریا..
میوانی گشت بەندەرێکەو..
پاپۆڕی چەرچییەکانی دوێی تیا خناکاوە

١٩٧٨/٨/١٢

# شوانی ڕوتەڵە

لەشەوینی، شوانی زستان

کاتێ گورگ فەرمان ڕەوایی گرتە دەست

بڕیاریدا.. شمشاڵو نای..

هەرچی قوڕگێکی دەنگ خۆشە

بەسیکاردی کەڵبەی برسی.. هەڵتڵیشێ.

بڕیاریدا..

هەرچی ڕووتەڵەی وڵاتە، بیانکوژێ

چونکە شوانی پەز ڕۆتەڵەن!

دەستی گۆچان ئەم گەلەن

بڕیاریدا، باجو باوان، مێرگی ژوان

لووتکەکانیش هەڵبەکێشێ

چونکە مۆڵگەی پەزی چوانن

چاوی کەلی بەربەیانن

١٩٧٨/٨/٥

# فولەگری زامەکانی
# هەژار ناکەم

کە دەبینم..جوتیارەکان، هەژارەکان

زەوییەکانیان داگیر دەکرێ

هاوینی درێژ

رێ بەرووبارەکانیان دەگرێ

بێدەنگ دەبم.

تالەدێهاتی مارەیی باپیرانیان

لەکێڵگەکان..دەریان دەکەن

کاورە کۆربەی پەزی شوانێ

لە (کەویسار)ی گیان دەکەن

بێدەنگ دەبم..

لەکودیلەی هاژەی لافاو پڕ زەنگ دەبم

تاکو چەوساوەکان خۆیان

لەخەرمانی زامەکانیان شین دەبنەوە

تابورکانی لووتکەکانیان، رادەپەڕن

ڕێک دەکەون کۆدەبنەوە

١٩٧٨/٨/٧

# ئاواتەکانی سەربەستی

بەناو رەگی هیوامانا.. دەتوێمەوە

دەبم بەئندێشەی رووت و..

لەقابلەمەی بەندیخانە

دەمکوژن و.. دەژیەمەوە

دەبمە مەلێ، لای رووبارێ دەنیشمەوە

کەنارەکان..

دەترسن و.. راوکەرەکان دەمگرنەوە

دەبمە گوڵ و.. لەمێرگی یادگاریما

بۆنم شۆخی شار دەیمژێ

لەپڕ، خێرا..

بەهار لەچیاکان زیزدەبێ و..

بەفر دەبێ بەلاڤارێ و.. ئگر دەڕژێ

*

ڕێبواری ئەندێشەکانم..
بۆ هەر شوێنێکی دوور دەچن
هەیتەکانی بەندیخانە..
وەکو شمار.. لەپێی بەربوونم ڕادەچن
*
دەستی سەربەستی دەرەوە
بەکەلەبچەی هەناسەی ساردم دێتەوە
جا هەیتەرەش..
ئاوا ئەندێشەم ڕاوبنێ
گەر شەپۆلی (گڕی گیانم) خۆی دەربچێ
دەبێ بەچۆن، تاوانی قورسی ناوبنێ.

١٩٧٨/٨/٢٦

# رازو سکاڵا

# بەستەی مەلێل

لەنێو چوارچێوەی سنووری تەسکم

چۆن هەڵپێژم ئەسری هەنسکم؟!

خۆ ئەگەر بڵێم: ئازادیم ئەوێ؟

تیرێک بەباڵو جەستەم ئەکەوێ!!

بۆیە چاو پۆشم لەو ژینە تاڵە

تا رۆژی ئەبێ خەمخوارم زاڵە...

ئەگینا ژینی نێو رک* کوا ژینە؟

پڕ لەمەینەتو ئازارو قینە...

١٩٦٧

---

* رك: قەفەس

# بەباوەڕ

لەراوابم، لەداوابم، لەهەر کویێ بم
لەدێهاتو لەنێو شارا لەهەر رێ بم
راستو رەوام، گسپەی سۆزی نێو کۆمەڵم
ریشە بڕی درِک گوڵی تاسە گەلم
کێردی دەستی کامی ژینی پێشکەوتنم
هەڵێنجەری گەردی بیری سەرکەوتنم
بۆ (داری زل) شوێن گرێکی درەختی بەر
بەباوەڕی زادەی مەبەست ئەبمە نەشتەر
کۆڵکەری رزیو، مڕوو مووچی، هەزار ساڵی
گەر بیبڕم، بۆ زویرن (ئەحە)و (قالە)؟

چەوساوەیی‌و دەردو مەینەتم سوار ئەکەم
ئەی تەقێنم! ئەوەی لەدڵە دەرئەکەم
ئەڵێم: خەوی سەر سەرینی چەخی پێشوو
ساویلکەیی‌و خۆپەرستی‌و نەفامی بوو
هەموو دێنم بەگڕێکی بیری رۆشن
ئەی سوتێنم ئەکەمەوە سروودی وتن
جا هەر ئەڵێم: لەهەموو شوێن ئەیلێمەوە
خۆم‌و هەستم یا مەبەستم ناتوێمەوە

١٩٧٦

خۆزگی توروسکێ، لەو ژینەی نەمویست
سردوودم ئەوت لەهێلانەکەم!
زایەڵەی هیوای ئازادیم نەبیست
لەگۆشەی خاکی نیشتمانەکەم

•

## ئەی کیژۆڵە

وەرە گیانە کەم تۆ مەستی من بە
خۆم بەخت ئەکەم، مەبەستی من بە
جارێ زۆر بەسۆز وەرە بەداواما؟
وەک یاری دڵسۆز منیش حواحوامە؟
بۆ هەر ئەبێ کوڕ مەستی ئێوە بن؟
لاوانی هەژار پەستی شێوە بن؟
بۆ من نەتبینم شادو سەرسام بم؟!
بەشێوەو وێنە دڵ پڕ لەکام بم

زۆر مخابنە: ئەو لەشە جوانە
لەژێر پەردەیەو دیلی زیندانە!
جوانیو ناسکیو تریسکەی نیگا!
بۆ بەپێچراوی بڕوا لەڕێگا؟!
جا ئەی کیژۆڵە تۆ وەرە بەدوام!
چەرخی بیستەمە دانیشە لەلام
باسی پێشکەوتن، شادیی ژین بکەین
نەفرین لەبڕوای پەستیو کین بکەین

١٩٦٧

ژین وەك ئاوێنە بۆ کەس نامێنێ
تەنیا هەر ژیرە خۆی تیا ئەبینێ
ژیان گەر ناوبێ، بێئاگر، نەزان
بەکلۆی سەهۆڵ خۆی نەسوتێنێ

## یادی دێیەکەم

تۆمارە لەیاد دێکەی رابردووم
شوێنی منالێیو رۆژانی زیندووم
ئەمبەرو ئەو بەر سینەی دێزەچیا
ئەڕوانێتە دێ رووبار لەبنیا
تارایی سەوزو ئاسمانی شینی
هاتی دەغڵو دان بەرزی پشتێنی
بالۆرەی کچان لەسەر کانیو ئاو
ئەزرنگێتەوە رووەو گوچێکەی لاو

تەپەی سواری راوکەری نێو دەشت

گورج تێئەپەڕێ بەرەو رووی بەهەشت

دەنگی بەسۆزی بلوێرو شمشاڵ

تەزوو ئەخاتە ناخی ژینی تاڵ!

باوەشی قەرسیل لەدەوری ماڵان

جوانی جیهانی بردووە بەتاڵان!

گفتوگۆی سەپان بۆ کاتی درەو

بۆ ئامادەبوون پرسیارە یا گرەو

ئیتر چۆن بژیم لەدوور ئەم دێیە؟

دڵم یادگاری ئەو کاتی پێیە:

کەدائەنیشتم لەشوێنی گوڵان

ئەمنوارشییە کانی بەردەڵان

ئاڕایتەم ئەکرد توانجی دڵداری

بۆ نازەنینی گوڵی بەختیاری!

دیمەنیم ئێستاش وەک خەونە لەیاد

لەڕووگەی شادیم بۆ ئادەمیزاد:

بۆیە کەپەنجەم بەپێنووس نەخشی

تیشکو پرشنگی ئەوێ ئەبەخشی!

بەویچتەی چیاکانی یارووبار

هونەری پێدام تا هاتمە گفتار

١٩٦٦

## پەیمان بێ

پــەیمان بــێ دایــە تــاکو دوا تۆڵــەم
پێشکەشی گەل‌و ئەو خاکـو خۆڵـەم
ئامۆژگـــاری تـــۆ هەمیشـــە دایـــە
بۆمــان پــەیڕەوو نەخشــەو بڕوایــە
تـاکو بەخشتی کـەم گیانی بێگـەردم
بـــەدۆڵ‌و چـــیاو نـــزارو هـــەردم
نـازی دوژمنـت ئـارەگرم بـەخوێن
مەرجــە تامــاوم نەشــکێنم بــەڵێن

١٩٦٦

# لێکدانەوەیەك

بەمێشکی بەتاڵ بەرەو کوێ ئەڕۆم؟
ڕێی تاقیکردن ڕێی دۆزەحە بۆم
مێشک بێ خوێندن گیرفانە بەتاڵ
ژیریم نایبڕێ سەرکەوم ئەم ساڵ
منیش وەک خەڵک دەبا پاڵکەوم
بۆ ساڵێکیتر نابێ بسرەم
بەڵام ئەوکاتەم گشت لەکوێ رابورد؟
ئێست هەست ئەکەم بۆوام بەسەر برد؟
بێگومان سستی کاری خۆت وا کرد
کات ساڵی بڕی منی ریسواکرد!
چەند ناشیرینە دوو ساڵ لەیەک پۆل
چاتر (حەماڵ) بم بۆ گەل بار بەکۆڵ

من جێمێنم هەڤاڵیش رادنە

بەسەرما لافی فیزاوی لێدەن

سالێ لەژینم لەدەستچوو کاتم

سەر شۆڕ بەگەردوون ئەبێ خەلاتم!

گشت هۆی ئەوە بوو نەم ئەخوێند رۆژێ

رابردوو چاش چی؟ پەنجە بکرۆژێ!

١٩٦٦

بۆ هەر کوێ بڕۆم بەگوڵ شیرینم
بزە لەسەرلێو یارم ئەبینم
ئەبووژێتەوە وەك خونچیلا بەهار!
ئەبم بەچەپکەی باوەشی ژینم

## هەنسلەو جوانی*

هەر چەند ئەکەم بێئارامم
یەک ناگرێ کامو زامم
بۆ دیمەنێک وزەی گیانە
نەرمە نیانە...
باڵای نازدار
لەناو گوڵزار

* بیرۆکەی ئەم هەڵبەستە لەهەڵبەستەیەکی (عەبدوڵڵا پەشێو) وەرگیراوە.

وتەی شیرین روویەکی گەش

ئەشک‌و سۆزی گریەی باوەش

بەڵێ جوانە...

گشت شێوازێ جیچی سورمانە!!.

** ** **

گیرانی بێیان پێکەنینی

کەبەناز بۆم رائەمێنی

ئاوازی دەنگی بزێوی

خەندەی چاوو دەم‌و لێوی

هەموو جووڵەو دانیشتنی

یا وچان‌و پاڵکەوتنی

ئاه هەڵکێشان...

بۆ یادگاری (شەوی ژوان):

بەڵێ جوانە هەموو کاری لەیار جوانە

گشت شێوازی جێی سوورمانە!!

** ** **

ڕۆیشتی سووکـو لەنجەی
ئەمووستیلە کردنە پەنجەی
هەستی پاکـو گفتی شیرن
باڵای ڕێکـو جەستەی خرپن
ورشەی قژی..
ڕەشی بژی..
لەرەی مەمکـو سمتی خڕی
بادەستی ناسکـو پڕی
سوری قاچی..
کراسی پاچی..
هەموو باسێ لەیار جوانە
بزەو گفتی جێی سورمانە!!
** ** **

هەستـو دەنگی وێنەو رەنگی

وێنەو رەنگی

ژیری‌و گڕی یادو بیری

تانەو تیری..

پەستی‌و شادی..

لێکدانەوەو کەوتنە یادی!

هاڵدانەوەی (پەڕی یادی)

لەدڵداری لەئازادی

گشت نەریتی لای م جوانە

چونکە ژینم بێئەو ژانە!

** ** **

هەر مردنی بۆم ناووتریٚ بڵێم جوانە

ریشەی جوانی تێکەڵ گیانە

چونکە ناشیٚ..

بێخۆشویستن بێدڵداری!

پڕ لەکین و بێبەختیاری

بۆ باوەشی..

یاری جوانی بکەوتە ناو!!

دەستبخاتە سەر قژی خاو

وەک مەلێکی نێو رکی چۆڵ

بەند کرابیٚ بەدەستی زۆڵ

(بۆ دڵخوازی پاکی جوانە)

بەڵیٚ جوانە..

نەک بۆ کەسیٚ لەناو تاوانە

بێبەزەیین ئەرەجێنن ئەو (دوو جوانە)

١٩٦٧

## هۆ.. شوان

کاکەی شوانی چاپووکو دلێر
دڵسۆزی بلیمەت بۆم لێدە بلوێر
بێلاوێنەوە جیهان بێنە جۆش
بە (لاوک)و (حەیران) لابەرە خامۆش
بەرامبەری دێ سۆزت ببەخشە
بۆ راو شوێن دابنێ نەخشە
بۆ روبارێ لەوەرگەی جاران
دانیشە لەژێر سێبەری داران
هەڵکێشە (ئاهی دەردی دڵداری)
رووکەرە کێوو لوتکەی هەزاری
ئەم خاکە جوانەی سروشتی ژیان
دەنگی ئاگرین هەڵدە بۆ گیان!

دەم دەم ئەگۆڕی شوێنی ئاژەڵت
هەستو هیوای نوێ ئەچێتە دڵت
بۆ ژێر کەندالّی بەرامبەری دۆڵ
دەنگت ئەداتەوە ئاوازی بەکوڵ!
ئینجا لەسەرخۆ بەشمشاڵەوە
بۆ بەرایی ڕانبەرەو ماڵەوە
گۆچان هەڵئەبڕی خۆ وریا ئەکەی
پسپۆرو زانا ئاژاڵ ڕێ ئەخەی
ەخۆر ئاوابوو رووناکی بڕا
مەل بۆ هێلانە گشتی هەڵفڕا
مێگەل دێنیەوە بۆ نێو قەرسیلی دێ
پاشی وچانێ دیسان دەستبەجێ

ئەڕۆی بۆ (شەوین) بەتاریکی شەو
چاوت وێڵ ئەکەی بۆ لێکنانی خەو
گۆرەوی (چلین) لێهەڵئەکێشی
لەگەرماو سەرما ئەڕۆی بێئیشی
خوا هەر بتهێڵی کاکی شوانی لاو!
کەجێی دێنی راژەکەت(١) تەواو

١٩٦٧

(١) راژە: خزمەت

هەندێ بۆ یەکێ بەکوڵ لەباسن
نازانن (کەر) بەکورتان ئەناسن
بەبۆنی (کەباب) دڵێك هەڵفڕا!
زوو بەداخەوە (کەر) بوو داخکرا

## رۆڵەی دوارۆژ

بەمنداڵی خۆت پێشکەش کە
هیوای تۆیە لەناو بێشکە
ئەو لەش و گیانەت بۆ چییە؟
کەپێشیلی ژێر دەستییە
بۆ رزگاری و بەرژەوەندیت
تاوژمنت لێی نەسەندیت
تەقەلا دە تاکو لاوی
بەفەریکی نەخوراوی
تاسەوێلکەو مێشک پاکی
رامەبورێرە بەبێ باکی
هەوڵ بدە کۆششبکە
بیر لەزانستی تیژ بکە

فێرۆی مەدە کاتی بەسوود

خەریک بە، بەهەوڵی خۆشنوود

بۆ پارێزگاری گەل‌و وڵات

تا ئەپشکوێ خونچەی ئاوات

ئەو سامانەی بەرهەم ئەبێ

نیارە (دوژمن) بۆ خوێنی ببی!!

دەسا وەک مەردێ سوێند بخۆ

دڵسۆزی خۆت بکە بەهۆ

بۆ سەربەستی خاک‌و گەلت

لەدەست نەچووە.. کات‌و هەلت

وڵات باوەشی ئەکاتەوە

هەڵمەتت گڕ ئەداتەوە

(خەبات بکە ئەی قوتابی

بەئاواتم زۆر تەبا بی)

پنجی ژیریت پەل بهاوێ

خوایە ژەنگت نێتە ناوی!

١٩٦٧س

# ئەندێشەو یاد

خەونە ئەبینم یا. راستە گیانە..؟!
باڵم تێهەڵسووی. ران لەسەر ڕانە
چەند بەتاسەوە بووم بۆ ئەم ئاواتە
دڵ وا پەرژینی دەوری باڵاتە
نازدار، با پەردەی سەردڵی خوێنین
بکەین بەتارای خەوی خۆشی ژین
بەناز ژیرم کە لەلێوی گەرمت
باجەستەم کپ بێ بەتەمی نەرمت
پارسەنگی مەمەت وان لەسەر بازوو
وەک یەک گرانن بێشکەی ئارەزوو
وێڵی‌و کەم ژیریم، پێت دائەمرکێ
کەدەست لەمل بین ئەبین بەچەپکێ

گیانی پیرۆزت گەنجینەی گوڵە
گوڵزاری خۆمەو بەهەشتی دڵە
وەک مێشکەی چاوگێڕ، مناڵی گریاو
جا تەشکت ئەگرم، بۆ فرچکی ناو:
باوەشی گەرمت وەکو (قۆزاخە)
جێی لەدیادچوونی خەفەتو داخە
بەپێ رۆژکەی ورد، پێو پا ئەکەم
ئەمژم شیلەی سۆز لەسەر (خوان)ەکەم

١٩٦٧

هەڵیدەوە پەردەی شەرم

بیسێنەوە سەڵاوی گەرم

گوێ مەدەرە (ناتۆرەی کوێر)

زووکە بۆلام نەرم.. نەرم

## ناکامی

لەهەردی ئاوات گوڵێکم رواند

خوێناوی سوورم بەسەر ئەپرژاند

هێندە شەیدا بووم لەبۆ ئەم گوڵە

چونکە هەڵچوونی بەپەڕەی دڵە

لاوی ئومێد بوو (باخچەوان)ی گوڵ

زۆصر بەپەرۆش بووم دەربێ پۆپ و چڵ

بەڵام باخچەوان بێ گرنگی دان

(گوڵی ئاواتی ئێمەی هەڵکێشان)!

١٩٦٦

# بێزاری

ئەی غەمی دڵ، هەر تۆی دوژمن
بۆ وەستاوی لەڕێگەی من
دەڵێم گەڕێ! بۆ خۆم بمرم
تارزگاربم وچوان بگرن
لەدەستی زۆرڵێکی وەک تۆ
کە ئەم شێبی، بۆ بەێ هۆ؟!
ئیتر ناڵێم بەم ژیانە
کەژیانە، غەمو ژانە
ئێشک گرێ هەموو کارە
لەگشت شوێنێ لەمن دیارە
وەک ئەفسونە خۆی ئەگۆڕێ

ئەبێ بە (خێو) بۆم ئەنۆڕێ

بۆ هەر شتێ دەستی بۆ بەم

ئامادەیە دەست بەجێ غەم

بۆهەر گوڵێ کە رووم تێکرد

بوو بەدڕکـو دڵی لەت کرد

یاپێش ئەوەی بێم بۆ بەری

گوڵی هیوای من زوو وەری

بۆ هەر کانی کە ئەچمە سەر

چکی ئەکەم.. نەمرم ئەگەر!

بکەومە دوا بۆ کام هیوا

هەر ئەی برم مەجە بخوا

بۆیە: غەمم بەسەر ژیان

نەگبەتیشم بۆ زۆر کەسان!

بۆهەر کارێ بکەومە رێ

(جەنابی) من هەر ئەی برێ

(غەم درۆیە.. هەر من غەمم)

(بەسەر ژیان پەردەی تەمم) ،

جاخودایە.. زوو بم سرە!

بۆ بەزەییت گیاننم شرە!!.

مخابن گوڵی ڕەنگینی بۆن خۆش

(گولێك)و (بەیون)و )لاولاو)ی گڵ پۆش

لەژێر تەپەی پێ، نەنجن.. نەجنن!

هەزاران چوزەی تر بوون بەخامۆش

## سکاڵ

شالوور چاوەڕێ گژی بەهارە

پەپولەش هیوای باخی گوزارە

تادێنن ڕۆژێ وچانێ ئەگرێ!

لەژێر تیشکی خۆر ئەخوێنێ ئەفڕێ

دڵیش بریندار غەمو پڕ ژانە

لێئەدا لە بۆ ڕۆڵەی تاقانە

ڕۆڵە: هەر من بووم پەروەردەم کردی

بەرەو سەربەرزی ژینم بردی

بەئارەقەی چاو، بەقوڵ کوتانم

بەخێوم کردی، گوڵی ژیانم

هەزار هەڵدێرو دەردم چێشتووە

تایەک پێ ئەتۆم بۆ پێش بردووە

کۆشبو مەینەتم: دەردی هەژاری

هەر لەبەر تۆ بوو، کەوتمە ژێر باری

هەر بەم ئاواتە، چیم لێت (چاو نەبوو)

چاوم لەژێری سێبەری تۆ بوو

کەپێ گەیشتی زۆر دڵسۆز بی بۆم

بەڵکو بەرهەمی رەنجی تۆ بخۆم

ئێستەش لێکەوتوو ریش سپیو پیرم

لەتۆ چاوەڕێ، یارمەتیو (خێرم)

تەنیا تۆم هەیە، ئەی خۆشەویستم

(شادو دڵخۆش بووم، ناوت کەبیستم)

دەستت لەنەمان ژیان گیر بووە

ئەی بۆچی منت لەبیر کردووە؟!

(لوقمه) دەمی خۆم ئەخستە زارت
تاپێم گەیاندی سووک بووە بارت
بیچێئەمەک مەبە وائەمرۆ رۆڵە
بەهانام بگە. باوکت کڵۆڵە!
ئینجا سەد سوپاس بۆ خودای گەورە
رزگار بکا لەم شوێنە نەورە
خوا دەستی بگرێ رۆڵە بەباڵات
گیرابێ لەلای نزاو سکاڵات

١٩٦٥

کەسم ناوێ بۆ فێڵی کەس
بن کۆڵم بیٚو دەرم بکا
ناشبم بە (کەس) بۆ خۆمو بەس
دەردەستەکەی پێشوو شکا

## پێنووس

بۆ من بنوویە: ئەی پێنووسەکەم
سەرو سامانم، بیرو هۆشەکەم
هەر کاتێ کە تۆ ئەگرم بەدەستم
شەپۆل ئەداتن دەروونو هەستم
بەڵام هۆی چییە ئێستا نانووسی؟
لێم کەوتویتە قین لەبەر کەساسی؟
لەگەڵما ئەدوێی ئەڵێی: پێنووسم
جا دیلی ئێوەم خۆمو نانووسم!
(ئێوەش بەزۆری پێم رەوان ئەکەن)
(هەڵە ئەنووسن راستی ژێر ئەخەن)

١٩٦٦

# نشینگە

ئەرێ هۆ گڵ..

چاوگەی بوونی دەروون و دڵ

چاک ئەزانی..

رۆژێ داوێ ئەخەیتە مل

چەند کەسانێک

بانازو فیز

بەسەر تۆدا تێئەپەڕن

وەکو بڵێی والەشەڕن

خۆ رێک ئەخەن بەئەسپایی

هەگیز بیریش ناکەنەوە

لەسووی کەس

ئەڵێی تەنیا ئەوان هەن بەس

قەپۆزی زل ئەجوڵێنن!

ئەقیرێنن!

بەخۆ بادان...!

باپارەش روو وەرناگێڕن

وا تێئەگەن..

لەتۆ نین، دارِشتەی زێڕن!

ئەرێ هۆ گڵ..

ئەرێ هۆ گڵ بۆچی (رازی)؟

لەناپاکی..

بەم ئارامە چۆن ئەزانێ؟!

لەجیاتی تۆ من بوومایە:

بورکانێک بووم..

بۆ خاوەن فیز کردەوە شووم

ئەتەقیم، دانەئەمرکام

تانەهاتنایە سەر بیرورِام

بۆ باشە رۆژ میوانی تۆن

رایان مەگرە..

(ئاگرە سوورن)..

لەناو سکت پشوو نەخۆن!

ئینجا ئەڵێن:

حاڵمان شرِە

بیان گوشە لەژووری گۆرِ!

بەبێ یادت کەهەر ئەیان پەستایەو

لێیان بکە بەزیرو هۆرِ!

فریو نەخۆی: پاڕانەوە
لەژیانیان..
بەڵگە نەبێ دوای پەشیمان
بیکە بەپەند..
تا تێبگەن پیاوانی (گەند)
ئەرێ هۆ گڵ..
چاوگەی بوونی دەروون و دڵ.

١٩٦٦

سوپاس بۆ دایکم منی پێگەیاند

منی لەباخی پیاوەتی رواند

خستمیە جەرگەی تێکۆشانەوە

تاکۆشکی پەستیی‌و دایلییەتیم روخاند

تاکۆشکی چەستیی‌و دیلیەتیم روخاند

کام تاسەی گەرم، بەموژدەی بەهار؟

لانەبا هەوری گرێوەی ئازار..

کام شەماڵی سۆز، لە چللەی هاوین؟!

کپ ئەکا قرژەی گەرما بۆ هەژار!!

# سۆزی باوەش

دڵ لەلای دایکی خۆشەویستمە
منی پێگەیاند کەپێویستمە
لای لایەی جاران ئەزرنگێ لەگوێم
بەئامۆژگاری رووناکی کرد رێم
خوایە، چ رۆژێ ئەمەوە باوەش؟
دایکی دڵسۆزم، منی چارە رەش؟
گەر خەوش(*) نەبێ ئەگەریم وەک مناڵ
(لاچەک بەسەرا) بوو، بۆ من شانزە ساڵ
بۆچی کەس نییە پێم بڵێ رۆڵە؟!
(هەڵسە دانیشە، (بسێنە تۆڵە)!
بۆ بەرژەوەندیم بۆ پاشە رۆژم
بۆیە لەدووریت ئەسرین ئەرێژم

---

(*) خەوش: نەنگ (عەیب).

بۆ ژینی خۆشیم بۆ من لەباسی
چاوی بێ وزەت دوور من ئەناسی
که ئەگەیپشتمە دەرگای ماڵەوە
ئەتخستمە ژێر جووتی باڵەوە!
هەڵتَ ئەمژیم ماچت ئەکردن
گشت غەم‌و تاڵیت لەبیر ئەبردم
بەوشەی (رۆڵە) بەوویەکی خۆش
ئەتلاواندمەوە بێگەرد فرامۆش
پاش حەسانەوەم بەڕێت ئەکردم
داوای سەربەرزیت لەخوا ئەکردم
شەو لەخەونمدا، رۆژیش بە (خەیاڵ)
هاوارم دایە دڵ بوویتە زوخاڵ!
هەریەکێکی وەک دایکم ئەبینم
بۆیە پرش بەدڵ لێی رائەمێنم
کەبانگی ئەکەم ئەڵێم:دایە گیان
ئومێد برِ ئەبم لە چێژی ژیان.
١٩٦٧

# ڕەهیلەی چاو

ڕۆژێ پەڕبووم بەشەقامی شار
ئەم خەڵکەم ئەدی سواڵکەرێک بێزار
(زۆر بەئەسپایی بەدەست پانکردن
ڕوو بەرەو ئاسما، سالاّکردن)
خەڵکی پڕ بەدەم، هەڵپچڕی (زەم)
پاش ملە وتەی ناشیرین و کەم
یا بەپاڵە سووری دژێ پڕ بەدەنگ
هەژاری بێچار، هەبوو وەک نەهەنگ!
نەپوول نەخواردن، پێی نەئەدا خۆی
خەڵکیش پێی نەدا: ئەو بوو ئەوبووە هۆی

***

دەوڵەمەند: با تۆ جێگەت بەهەشت بێ!
تەلاری بەرزت، شوێن گوڵو گەشت بێ
جلی (فاسۆن) وابریقەدار
برشۆی لەبەرتا لەگەڵ دوو نازدار
گیرفانی پڕو ئۆتۆمبێلی جوان
پیاوەتی کردن، یا خۆهەڵکێشان
فیزت بەتەقەی (پێڵاو)ی تازە!
تۆز لێنەنیشتوو هەربۆ تۆ سازە!
ئەی پاشی مردن، بۆ کوێوەی ئەبەی!
یامەتی هەژار، داماوێ نەدەی!
هەژار: دەبا تۆش بەشت هەروابێ
ئەو رەنجەش ئەی دەی هەمووی بەبا بێ
بێهیوای ژیان دڵت غەمگین بێ
گیرفانت کونو خاڵی زەبوون بێ

جله چاکەکەت دڕاو سەد پین بێ

خواردنت (نانی برِوێشی قین) بێ

کاریش کە هەتبێ (دە) رۆژان نەت بی

لەهەندێ شوێنیش دزو جەردە بێ!!

ئەی خوا ئەم (حاڵە) تاکەی ئەهێڵێ

هەژار لەگۆڕی ژینا ئەشێلێ!

***

ئنجا منیش دێم شینت بۆ ئەکەم

چیت ئامۆژگارە جێبەجێی ئەکەم

ئەگریم: دار دەستی شوونی هەژاری

کوشتت لەبرسا لاو لەژێر باری..

هێندە گران بوو نوشتی هێنا

خوایە بەزەییت بۆچی نەهێنا؟

جا ئەو هەڵبەستەم پێشکەشی تۆ بێ

لەنێو گۆڕیشا گوێت لەڕۆڕۆ بێ!

١٩٦٦

# وازدێنم.!!

بتۆ بووی تەلاری ژیان و هیوا

لەباخی تۆدا گوڵاڵەم روا

با ئەو تەلارەش بۆ من روخابێ

ئەو گوڵەش لەباخ سیس و بێئاو بێ

بەختیاری ژینم: ئاهو ناڵینە

کام دڵداری راست بەشی بەزینە!

واز دێنم ئیتر لەژین دەس ئەشۆم

یەخەی تۆ ئەگرم خودای بەختی خۆم

دڵداریم لەکۆش ماتەمی غەمە

رۆژی رووناکیش بۆ من هەر تەمە

ساتقی بەهەشت گشت کەبەش کراوە

تەنیا هەر بۆ من ئەوەندە ماوە!

یابەزیندوویی نقوومی گڵ بم

یا بۆ بێبەشی ژیان‌و گڵ بم؟!

چێتر دۆزەخی تاڵی‌و ئەشکەنجە

بۆ بژیم لەداخ بەبای ئەو رەنجە؟

١٩٦٦

مانگ درەوشاوە خەڵکی پێ شادە
رێ بەردی بکا رێبوارو پیادە..
بەڵام کەونبوو مەرج نییە ون بێ
بۆ سرەو بگرێ لەچەق رێگادا؟

## هەستو شانازە

بۆبزەیێک سەربەست ژیان
خۆم لەلیستەی ژینا ئەسڕم
تاکاروانی هیوا ئەگرم..
کورج بێ وچان..
بازووی هەڵمەتی تێکۆشان
ئەخەمە کار..
لەلادێو شار
بۆ نووزەی پرشنگی هیوا،
ئەو تیشکە پیرۆزەی کەوا
هەر بستێکی بەخوێن ئەکرم
وەک پەپوولەی ئومێد ئەفڕم

بەدەوریدا ئەخولێمەوە
یاتێ ئەچم ئەتوێمەوە
با نەمامێ لەو ئاواتە
لەم ولاتە ئەڕمێنمەوە
پەڕەی دڵی بۆ ئەکێڵم
بو لووتکەی خوێناوی کێلم
ئاودێر ئەبێ بەئەسرینم
بەتێکەڵاوی تنۆکی خوێنم
تا دێـە بەر..
بۆ سەپانو چینی رەنجدەر
جابەیانی زۆر بەپەلە
لەگەڵ گزنگی دەم کەلا..
وژەی موژدەی بەخوێن نووسراو
هەڵئەواسرێ بۆ گۆڕی (الاو).

١٩٦٧

# ماڵ ئاوایی

پێشکەش بە کاک (بارام شوانی) بێت.

کەنیمچە ژیانێکی بەم جۆرە رابوارد..

چەند ساڵی شەدای بەژن‌و باڵاتم

بەخیاری ژیان بووە ئاواتم

گوایە تۆم هەیە زۆر شادومانم!

سەچاوەی سۆزی تەلی کەمانم

خەزانی رۆژگار هەڵیوەراندی

لەدڵداریدا چاکی بەزاندی!

ئەو هەڵبژاردەی پەسەندی ئەکەی

کڵۆی ئاگرە، دەستی بۆ نەبەی

چونکە ئو دڵەت ب ۆمن رسکاوە
بێ خۆشەویستیت خوێنم وەستاوە
ژینخی بەخیاریت نەدەی بەپارە
دڵی دڵداریت،هێشتا زامدارە
ئەگەر چی ئێستا کەوتیە منجە منج!
بۆ شوو ناخوێنی، ڕێکوپێکی قنج
توخوا گۆڕاوی! باوەڕیش ناکەم
یاباوکت ئەڵێ (کیسە پڕ ئەکەم)
ئەتۆ ئەفرۆشێ بە (ماڵی دنیا)
بۆ دۆزەخ بچێ، ئاگر بەبنیا.
من دەربەست نیمە، بۆ تۆ زگیانە
پەنجە ئەگەزێ، ئەڵێی ژیان ژانە!

ناشیرینم چی، یا خو هەژارم؟
ئەم فێڵەشت چوو بڵێ بێزارم..
دڵداری ناکەم، دڵداری پوولم!
نایمە داخواز هەڵماڵم قۆڵم!
چۆن ئابڕوت هەیە بۆ یەکێ تربی
(بەکاڵی بتخۆم، گیووت سوور بی)
تاکەی بەنامە غەمم ئەدەیتێ!
کۆتایی بێتە، باکات نەفەوتێ!
ساڵی خوێندم لەسەر تۆ دانا..
چیم لێت چاو نەبوو تاهەم بوو توانا
ئەم (وانە خۆشەو وتە شیرینە)
تێبگە: شەڕی خەنجەرو خوێنە!
گیانم بۆ چییە پاشی نەمانت؟
تابەتاوانێ بمە (قوربانت)!
بۆچی کەم هەستی ئیتر چۆن نەمرم؟
ژینم بەباچوو، چاو پڕ لەئەسرم

١٩٦٦

# هونەر

هونەر ئەبڵقێ لەدڵ وەکو خوێن
گڵپە ئەکاتو ئەجوڵێ بەتین
فریشتەی هونەر بەکۆمەڵە دێن
ژینم تنەخان کەم! ئامادە بێ شوێن
هونەر: تۆی کانی دڵ تێنوو شکێنم
ئاوی زیندەگی ژیان بزوێنم
بێزار نابم لێت، چەند ناوت ببەم
ئەی هیوای روونو بڵێسەو پیشەم!
ژیریو زانینن نرحی خۆی نواند
نەمامی ژینت لەپنچا نواند!
چونکە شابۆڕی خوێنی ژیانی
ئاڵو رەنگینو هێزو تەکانی
رژێمی کارو سازی گیانی
کردەوەی گرێی کوێرە دلانی!.

١٩٦٥

# نیگاکەت

دەنگی ناسکت سۆزی کەمانە
چاوی گەشی تۆ، کانی غەمانە!
هەنگاوی وردت نەخشی سەر دڵە
وشەی سڵاوت بۆنی گوڵانە
پرچی خامێنت زنجیری ملە
مەمی سار سینگت بزەی لێوانە
قەدی باریکت چنووری بەرزە
کاتێ نەتبینم لای من تاوانە!
نیگای بێوێنەت، ئاوێکە بێ بن
رووناکی ژینم، تۆی بەم چاوانە
هیوای هاوسەری دوا رۆژم تاسەر
گفتو پەیمانت مەبەستو مانە!

١٩٦٦

# هیوای بەهار
# داد لەزستان..

لەزستانی شوومی پڕ ژان!
کرێوەی ئۆف ئەبارێنێ
تەن و دەروون ئەتەزێنێ
بەهەر بەرگێ خۆم ئەپۆشم
هەر سەرمامە..!
ئەژنۆی تەزیو هەموو زامە!
دڵ بێ کامە..
جا ئەچم بۆ پەناو پەسێو
لای ئاگردام..
بۆ پشوو دان..

تاگەرمی کەم پەنجەی نەزیو

سەیر ئەکەم ژیلەمۆیە

ئای بیّ چاری..!

چۆن ساردی ئەم پڵو بۆچە؟

دائەمرکێ بەئاسانی

بیەکجاری..

پیاو چاکی بۆهەژار کۆوانێ؟

رزگارم کاو دەستم بگرێ؟

فرمێسکی بێزاریم بسڕێ

کوانێ بەهاریش دەرنەکەوت؟

هەر دەرنەکەوت..

بەهار خۆزگەم بەنەورۆزت؟

بەگڕی جوانی پیرۆزت

تابەگڕی گەرمی پرشنگ

لەگەڵ بزە بەخشی گزنگ

ئەبڕایەوە سەرماو سۆڵی

زستانی زۆڵ..

رزگار ئەبووین لەگڵۆڵی

بەهەڵپەرێکێو بەستە وتن

لەنێو جەرگەی چیاو دەشتو دۆڵە

گیای نەرمو نۆڵ..

تا بەتیشکی خۆری رۆشن

ئاسۆی بێ بن..

پەردەی بەفری کەلی هیوا

ئەتوایەوە..

ئاواتێکی تازە ئەڕوا

تاکو هەموو بەربەستی

ئەخولاینەوە...

بەپڕ هەستی..

بەدڵشادی

لەكوش بەهەشتی ئازادی

خۆزگە نیازم هەئاتە دی

لەناو ئەچوو ئەم زستانە

سەرما زیندە بەچاڵ ئەبوو،

لەباخی ئەم كوردستانە

ئەو زۆردارە لەناو چەوو

تاكو ئێمەش..

بەگیانو لەش..

دەس لەدەس بەنگ دەربرشین

هەڵپەڕین..

دەستە دەستە كۆمەڵ كۆمەڵ

كچی شۆخو ئێمەی كوڕ گەل.

منی کە پێشێلی دەردی نەبوونیم
بێ نازی پوولو فێری زەبوونیم
خۆزگەو ئەندێشە نازو هیوامە
سەرمایەی گیرفانی (شیعر)ی بەتامە

گیانەکەم بەگوڵ، ناوت هەڵنەدەم
هەچەند جوانتری، لەگوڵی خەندەم
چونکە جوانی گوڵ بێ ئەندازەیە
بۆیە بەوشەی (گوڵ) ناوت ئەبەم

## هەردوو هەژارین

(راستی) ئەم وشە پڕ مەبەستو پاکەیە زۆربەی خەڵکیش پلاری کوێرانەی تێئەگرنو پشتیان تێکردووە دوای کڵاوی بابردوو کەوتوون هەورەکو لەم هەڵبەستە (چیرۆکی) یەی (جەمیل زهاوی)یەوە دەری خستووە منیش بەدەستکارییەوە وەرم گێڕاوە بۆ زمانی کوردی..

رۆژی بەتەنای، پەست ئەرویشتم

بەپیرێکی پشت کۆماو گەیشتم

لەچەقی رێگا ئەڕۆیشت لەسەرخۆ

سیپاڵ شرۆڵو بێدەنگ، گفتوگۆ

جل پینە قڵیشای خاوێن

بێدەنگ کزمات دیار بوو پاکداوێن

لۆچ لۆچ کەوتبوە نێو دەمو چاوی

تەکانی ئەدا بەپەشۆکاوە..!

خەڵک لەدوایا بەچەپڵەی دەستیان

جوێنیان پێ ئەدا، ئەو بێ وەڵام دان

دەمێک ئەبزووت، یا پشووی ئەدا

خەڵکیش زیاتر (چەنە)ی لێئەدا!! •

چوومە پێشەوە، لێم کردن پرسیار:

ئەوی کێیە وا مل کەچو هەژار؟!

لەوەڵام وتیان ئەو ە(ئاستی)یە

توانجی (ناراستی) رووی تێکردیە

نزیک بوومەوە، پێی دەم یارمەتی

تادەری بێنم، لەژێر هەڵمەتی

ئەو خەڵکەی زۆرەی نەزان و زۆرجار

منیش فرمێسکم بەگوڕ هاتە خوار

دەستم گرت پێم وت: هەردوو هەژارین

منیش وەکو تۆ، وا لەئازارین

جا رۆژی دادێ (گەواهی[1]) بێنن

بلێن هەر ئێوەن، پەیام گەبێنن

---

[1] گەواه: شایەدی.

# روبارێکی خوێناوی

## ئەو بڕپارەی دروێنەی خەوی کردم

مەلی هەژار
لەفڕگەی ژان هەڵدەنیشێ
پێشمەگەی لێدادەبەزێ
هەرچی کانیاوی سەنگەرە
بۆ روباری بەهار دەزێ
***

بڕیار وایە
بەهار بێت‌و،
دەیان چەپکە نێرگزی جوان
لەسەر گۆڕی شەهید بڕوێ.
بڕیار وایە
خوێنی ڕژاو،
لەڕووباری سەروەریدا
خوڕەی نەمردنی نەنوێ
***

بڕیار وایە
کۆتری دەنگی شوانەکان
لەقەد پاڵی شمشاڵێکا
فوو بکاتە جۆگەلەی دێ.
بڕیار وایە
تەوری دەستی خۆڕی بەیان
گڕ بەرداتە بارەداری زستانی شەو
بڕیار وایە
کۆتری دەنگی شوانەکان
لەدۆڵەکان شووۆڕ بێتەوەو
سواری رووباری خوێن بێ

ناوزەنگ ١٩٧٩/١٢/٢٩

# سەری ساڵێکی ڕاپەڕیو

سەری ساڵە

وا کۆتری ژانی مریەم

هاتۆتەوە ناو هێلانەی مەسیح-ی خەم

مۆمی تەمەن

فوو لەخەوی مردن دەکاو

لەنشێوی تاریکی کێو دێتە خوارێ

خۆری تەمەن

بۆ ئاهەنگی بوکـو زاوا

میوانی خەونی سوور دەبێ

وەک رەهێڵەی وەرزی بەهار

لەچاوانیا گوڵ دەبارێ

سەری ساڵە

ماچی شۆخی شۆڕش تاڵە

بولبولی ئاسمانی ئەمڕۆ

لەسەنگەری ژێر کرێوەی ئەم سەردەمە

لەگەڵ کڵپەی کریسمس-ی ئەشکەوتەکان

دەبنە گرمەو هاژەی بەخوڕی ئەم چەمە

***

سەری ساڵە

وا بڵێسەی چەندین ساڵی بنکەی سووری

پێشمەرگەکان بەتین دەکەین

لەگەڵ کێوە بەرزەکانا

چۆپیمانەو بۆ نەورۆزی قوربانیمان

ئەسپی هەژاران زین دەکەین

ئەی ئەستێرەی شەوانی ئێشک گرتنم

لەباتی من.. بەنهێنی

خەندەی جەژنی ئەماڵ بەرە

رەنگی خوێن‌و کەللەی سەرە

ئەی ئەستێرە

خەندەی گوڵی ئەمساڵ بەرە

بەحەسرەت بوون بۆ ئەو شارەی

لەکانیاوی بینایی چاو

ماچی شادی بخۆنەوە

بۆ ئەوانەی بەئاواتن

خەمی گڵکۆی شەهیدەکان

بەشەونمی سەروەریی خۆر بشۆنەوە

ئەی ئەستێرەی یەکەم شەوی ئێشک گرتن

بۆ بەیانی

که چویته‌وه بۆ شاری سێداره‌و کوشتن

ئه‌ی ئه‌ستێره، وا تێنه‌گه‌یت

فرۆکه‌یت‌و، بۆدومانی دوژمن ده‌که‌یت

لاسای فاشیست نه‌که‌یته‌و

من ده‌مه‌وێ

چه‌پکه گوڵی نامه‌ی رزگاریم به‌یته‌وه

سه‌ری ساڵه

ماچی شۆخی شۆڕش تاڵه

باڵه فڕه‌ی خه‌می له‌یلا، هه‌ورێکی گران ئاسمانه

ره‌وتی روباری کوردستان

هێرش ده‌با بۆ ده‌ریاکان

باڵه‌فڕه‌ی گڕی له‌یلا

لەتورەیی بورنەکان دەخواتەوە

لەسەر چڵی

بیابانی گڕ هەڵدەنیشێ

کەو دێنێتەوە کێوەکان

ڕشانەوەی شۆڤینییەکان دەشواتەوە

زەڵێ ۱۹۸۰/۱/۱

## رووبارێکی خوێناوی

بۆ دووەمین یادی شەهد (ئارام)ی تێکۆشەر پێشکەکە

ئێوارە بوو..

شاسوارێ هات

ئەسپی سپێدەی راپەڕاند

خۆری چاوی هەزار هەڵهات

ئێوارە بوو

بەسەر لوتکەی ئارامی شۆڕش هەڵگەڕام

پەنجەی خوێنم

بەناو چاوی دوژمن تەقیو، لێێ دابڕام.

ولآت شەوەو

ئەستێرەکانیش پێشمەرگەن

لەشەقامی بورژواکان

هەراج خەوەو

گوڵی چەکداری زامەکان

رۆڵەی ئەم دێیە بەجەرگەن

***

شاسوارێ هات

خەمی شەهاب-ی هەڵگرت‌و

دای بەکوڵی گڕی هەتاو

چەکی جەعفەر-ی هەڵگرت‌و

نای بەسنگی حوزەریانی لەژان سوتاو

تیشکی ئەنوەر-ی دا بەکوڵ

هێنای بۆ ناو سەنگەری دۆڵ

***

ولآت چەمی خوێنی زۆرە

دەنگی ئارام

لەزۆر گوڵدانی چەم روا

هەموو کێویچکەی کوردستان

ئێستاش چاوی یەکەم سەنگەر

بەخوێنی کاک ئارام دەشوا.

هاوڕێی شەهید..

وامەفرەزەی وشەکانم

بۆ دێهاتی هۆنراوەی جوان

لەیادی تۆ

زەوی خەمم

بۆ جوتیاری هەژاری گوڵ دابەش دەکا

وا مەفرەزەی دەربڕینم

بەگژ غەریبیدا دێت‌و

وەکو سرودی سەرکەوتن

رستەی: گەماڕۆی کوردستان

بەیادی تۆ پێشکەش دەکا

هاوڕێ ئارام

گەر رەشەبا

کۆزە ئەسپیندار سەربڕێ‌و

جۆگەی خوێنی،

زۆرەملێی کاروان ببا لەدەشتی شەو

کارگەرەکان چاوی کوورە دەکێڵنەوە

زریانیش بێ

خێوەتی ئارام هەڵفڕێت

هێلانەی کەوی ئاگرین

لەدەروونی برسییەکانا دەهێڵنەوە

گەر کڕێوە

بەفری سپی بکا بەکفنی ئەم خاکە

قرچەی هاوین، چلەی زستان

تا بەهار دێ

رووبار لەمردن بێباکە

زەڵێ ١٩٨٠/١/١٠

# مێژووی ئازارەکان سەوزە

سەردەمێ بوو

رەشەبایێ

بەئەستوونی چوار چرادا

کۆچی سێدارەی هەڵواسی

هاتو رۆیی

تانەگریاین کەس نەیناسی

***

رەشەبایێ

ئاگری باڵ گرتووی سەوزی

لەخامۆشی بەهار نواند

لافاوی گریانی سنە-ی

لەخوێنی سابلاغدا خنکاند

ڕەشەبایێ

لەشەقامی شای ستەما مافی گرت‌و

نانی هەژاری وەدەردەنا

هەناسەی ژان وەک شەماڵی هەتیو گریا

گریا.. گریا..

گریا..

***

ڕەشەبایێ.. هات‌و ڕۆیی

لاوکی پیادەی بن بناری شۆڕ کردەوە

سرودی چەکی بڕواکان

بۆ هەڵدێری گەرووی مردن

کەوتەوە ناو دەنگی دوژمن

کەدیواری یانەی زۆردار بەرز بووەوە

پرسیم خشتی ئەم دیوارە

لەکوێوە دێ؟

شیشی پەنجەرەیێ وتی:

گڵو ئاوی کوردستانەو

لەئینجانەی دەرگاکانی ئازار دەڕوێ

دەبنوارڕن..

قەنارەی زستانی بەفر

چۆن گەرمایی خوێنی برسی دەخنکێنێ

دەبنوارڕن.. خوێنمژی نان

چۆن فەلاقەی دارکاری شەو

لەسەر سینگی ئێسکـو پێستا دەسوتێنێ

دەسەیر کەن..

دیلە گیراوەکان تینون

ئارەقەی شەق دەخۆنەوە

بەندە هەژارەکان برسین

وەک خەرمانی خامۆشی لاو

لەدوای کوشتن

تەرمەکانیان باڵدەگرن و دەڕۆنەوە

بۆ ناهێڵن قەتارەی خەم

لەزەلکاوی بەندیخانە وێنە بگرێ

دەسەیر کەن

ئادەمیزاد تیشکی خۆرەو

لەدۆزەخی مردووەکانا دەستوێنرێ

بۆ ناهێڵن

جوتیاری دڵ لەدێهاتی سنووری گیان

سەربەست بژی

بۆ بەهۆرەی زۆرەملێی تۆران دەکوژی

***

دەبێ چاوی هەتاوی ژان گەل ببینێ

خەرمانی باوەڕێکی سوور

بۆ هەژاران، سکی تێربوونی بنوێنێ

دەبێ گڕ بێ

خۆر بەکوردی لەکێوەکانا باڵ بگرێ

تارانکـو چۆغەی ئازادی

لەئاوزەنگی رەگی گولا

تفەنگی بەرگری بگرێ

تافرمێسکی گولاڵەکان

بەبرژانگی لێدان بسرێ

***

دەسەیرکەن..

بازامەکان، ئازارەکان بناسنەوە

گیراوەکان، سێدارەکان بناسنەوە

بابێدەنگیی بچێتە بەردەمی چەقۆی هەڵسانەوە

باتاریکیی لافاوی کپ برِوا بەرەو کشانەوە

وا شارە خنکێنراوەکان بەجێ دەیڵین

بەرەو سەنگەر. بەرەو شۆڕش

هەویری ئازوخەی برسی

لەهەورازی ئاوازی گەلدا دەشێلین

دەبا ڕێگا لەگەڵما بێ

ئێمەش خوڕەی ڕووبارێکین

چونکە هەموو گوڵی خەونی منالانین

باخی ڕزگاری شارێکین

***

دەبتوارن ئەم هەتاوە

جامی سەری پاسدار-ی شەو دەپەڕێنێ

ئەم هاتاوە دژی تۆپ و تانکی دوژمن

دەنەڕێنێ

دەبنوارن وائەمجارە

شەپۆلی لاوکـو حەیران

گەیشتە گوێی لەخەو هەڵسان

خەونی گەرمی دڵدارەکان

تەونی خوێنەو جوتیارەکان وا دەیچێنن

برینی قوڵی دەزگیران

کاروانێکی ئاگرینەو

لەگەرمیانی دەشتی تینو

تۆڵەی هەڵواسین دەسێنن

لەکوێستانی چیای برسی

تۆڵەی ماندوو بوون دەسێنن

زەڵێ ١٥/١/١٩٨٠

# چەپکە گوڵێ بۆ یەخەی هەڵوێستی ژنەکەم

وەک خەمێکی باڵداری شار

لەهێلانەی خۆر دەگەڕام

کەتاریکیی شەقامەکان پێیان زانی

هاتن دەرگەی سبەینێیان لێ کلیل دام

***

خۆشەویستم

ڕەنگە فرمێسکی غەریبیت

لەکانیاوی تەنیایا هەڵبقوڵێ

ڕەنگە لاشەی کۆتری گیان

لەزیندانی دەروونی تۆ

وەک مەنجەڵی چێشت بکوڵێ

ئەرێ گیانە کەی هەناسە
لەناو جریوەی بەربەیان
هەواری دۆزەخیماڵوێرانی
تکەی قەڵاشکەری سەرمای
لەئاگردانی دڵ دیوە؟

***

خۆشەویستم
دەشێ هێشتا تێم نەگەیت و
چۆلەکەی بیر بەسەر چڵی خۆزگەکانتا
جۆگەی بێزاری گڕ بگرێ
تۆ بڵێی هێشتا تێم نەگەیت...!
گیانە..گیانە

مامزی ئاوازەکان

لەکۆڵانی ئاهەنگی شار کەوی نابێو

نابێ.. نابێ

نابێ لەئێستگەی دوژمنان

راو بکرێ.. باڵی بکرێ

***

ئەرێ گیانە

کە رووبارێ وشک دەبێ

کەنارەکان پەنا دەبەنە بەر پرسە!

کەپاییز دێ

گریەی ماڵە سووتاوەکان

وەکو لافاو بۆ روبار دێ

بەڵام گیانە

خۆ تۆ خوێناوی روباری..

تۆ هەتاوی

لەغەریبی

لەتەنیایی‌و تاریکیی زیندان مەترسە

***

خۆشەویستم

گەر پرسیان کوا هاوسەرت!

بڵێ رۆیی‌و

نەیوست بێ بەشۆستەکان

تا پۆستاڵی زوڵمی ئێوی پیا تێپەڕێ

نەیوست بمرێ

نەیویست بێ بەرێ

نەیوست قیر بێو
لەشەقامی پیاوەکانتانا خۆی هەڵسوێ
نەوەک زیلی رەشەباتان
گەردەلوول بۆ چیا ببا
نەوەک تۆپی کرێوەتان
خەرمانی دێ. بۆ گیرفانی بەغدا ببا
***
خۆشەویستم
بڵێ رۆییو، پێی خۆش نەبوو جارێکیتر
پەتی خنکان بێتە میوانی زیندانی
ئەو خەمی بوو
نیشتمانی زامەکانی بسوتێنێو
گوڵی شۆڕش، لەدووری ئەو گریانی بێ
***

ئەرێ گیانە.. کەپرسیان

بڵێ رۆیی‌و.. چونکە ئێوە دەتانەویست ماشێنێ بێ‌و

سەرمایەی ئێوە لێخوڕێ

بڵێ رۆیی‌و

نەیوست نانی دیلی بخوات

نەیویست تفی شۆفینیتان

رووی چەوساوەکان سواغ بدات

دەتانەویست شاعیرێ بێ

کوێستانیی بێت. گەرمای بیابان هەڵمژێ

هەژارێ بێت، چڵکاوی ئێوەی پیا بڕژێ

خۆشەویستم

گەر پرسیان: کوا ئەو گڕە

بڵێ رۆیی‌و، بەم زستانە لەئاسمانی

هەژارانا دادەگیرسێ

بڵێێ رۆیی. بەم سەرمایە

کێ بزانێ روتو قوتە، لەو دەپرسێ

گیانە:، بڵێ

ئەو ئاگرە، بەردەبێتە رقی ئێوە

ئەو ئاگرە، ئاگردانی پێشمەرگەیەو

بابەگورگوڕی جوتیارە

تاوی گەرمی کرێکارە

ئەو ئاگرە، عاشقی ئازادی گوڵە

بۆیە باخی هەموو دنیای لالەبارە

***

وەک خەمێکی باڵداری شار

لەهێلانەی خۆر دەگەڕان

کە تاریکی شەقامەکان، پێیان زانی

هاتن دەرگەی سبەینەیان لیٚ کلیل دام

بەڵام لەشکری نیوەڕۆ

شاری خەمو تاریکیان داگیرکردو

سروەی خۆر، بوو بەوێردی هەژارەکان

کلیلی خوێن، دەرگەی رزگاریی کردەوەو

بوو بەگوڵی دڵدارەکان

زەڵێ

١٩٨٠/١/١٩

# سوردی هەژاران

ئەی چەوسێنەر.. نان دەپرسین
تۆ ناتوانی ئێمەی هەژار قەدەغەکەی
ئەی داگیرکەر، هێزی برسین
تۆ ناتوانی گەرووی شۆڕشمان خەفەکەی
***
ئەی چەوسێنەر.. لەمڕۆ بەدوا
کەس ناتوانێ رەنجی کرێکاران ببا
هۆ داگیرکەر.. لەمڕۆ بەدوا
هێز ناتوانێ.. بەری کوردستانمان بخوا
***

هۆ چەوسێنەر..

والەشکر سک سوتاوان ئاگر دەگرن

هۆ داگیرکەر.. زامی ئێمە

وەک هێرشی ئێوە دەمرن

ئێمە دەژین... لەناو بنکەی هەتاوی ئازارا دەژین

روبارێکین... لەگەڵ روباری گشت جیهان رێگە دەبڕین

هۆ داگیرکەر..هۆ چەوسێنەر

ئێمە گڕی چاوی ژانی کارگەرانین

چەکوشێکین..کێوی فاشیزم دەڕمێنین

مافی هەژار... بەتفەنگی گەل دەسێنین

زەڵێ ١٩٨٠/١/٢٥

# جەژن

گەر نەورۆزی دوێنێکەمان

لەناو شەپۆلی ئازارا

ئاشبەتاڵی

سەرکردەکانی خەوتن بێ

ئەمڕۆ دەنگی راپەڕیوان

دەنگی منالأنی هەژار

دەبێ جەژنی سەرکەوتن بێ

زەڵێ ۱۹۸۰/۱/۲٦

# کۆتر

گەر دوژمنان
نیشتمانم گڕ تێبەردەن
پەڕی ئاشتیم یەک یەک دەرکەن
وێران بکەن هێلانەکەم
هەزار جار پێم بڵێن کۆتر
پارێزگاری لەخۆم دەکەم
هێرش دەبەم.. هێرش دەبەم

زەڵێ ٢٧/١/١٩٨٠

# زیندان

مامزە کێوی مافەکانم

لەزیندان بێ، یا لەشەوی شارا بمرێ

لەکەنداوی خوێنا بژی

یا وەک نێچیر لەژێر گۆچانی راوچی بێ

یاخەڵوزی، گڕی شریخەی قامچی بێ

گەر سنووری لێتەنرا بێ

با هەر گۆڕی جەژنەکانی

لەناو زوڕنای بەهارا بێ

زەڵێ ١٩٨٠/١/٢٨

# زەنگی شۆڕشی کرێکاران

ئاوو گڵی ئەم سروشتە
بۆ پێویستی خەندەی مرۆڤ
دەکەین بەهۆنراوەی ژیان
پێستی ئەسمەری ئێمەیە،
بەردو خشتی خانووی بەرزو، شەقامی شار،
دەشێلێتو ئارەقەی خوێن
هەڵدەسوێ لەگیانی دیوار
ئێمەی هەژار. بەتەشیو تەونی بیری ژان
پێستو خوری، لەکارگەی دەستو پەنجەدا
کەوشو بەرگی ئادەمیزاد بەرهەمدێنین
هێشتا نیوەی جامی رەنجمان
بۆ ماندوێتی لەش ناستێنین
***

ئەگەر ئێمەی بەلەنگازان
شوانی هەموو پەزی گیابین
گۆمانی مێشکی گڕگرتوو
خۆ دەتوانێ
فیوداڵ بۆ یار هەڵگرتنی ڕێ ڕاگرین
ئێمەی هەژار، ئێمەی ئازا
خۆ دەتوانین خوڕەی ڕوبار، گەواڵەی قین
بێنینە سەر شێرە بەفرینەی زەمین
ئێمەی هەژار.. دەمانەوێ سەرکردایەتی گەل بکەین
کونە کایەدەست، دەنێ هەردەم لەسەرکەوتن دڵنیا بین
ئێمەی نەبەز، پێشمەرگەین و
دەبێ لەچەکدارانی دوێ. ئێمە جیا بین
***

ئەگەر ئێمە، ڕەوتی هەموو زێرابەکان
لەناو بۆڕی ژێر شەقاما بخنکێنین
چڵک و گەردی کۆڵانی شار
بەفربەندی گەسکی تێلا
ئارەقەی سواڵکەر بڕژێنین
چۆن ناتوانین، چەوسێنەر وەک پەز لێخوڕین
چۆن ناتوانین، خوێنمژی گەڵمان سەربڕین
وەکو چۆن بیر، بەناوی مێشکی ئێمەی تینو، ئاگر دەگرێ
وەک چۆن گوللە بەناو لولەی کلاشنکۆفا ڕێ دەبڕێ
چۆن برسێتیی نان دیلی دەکاو
لیکاوی گەدە دەڕژێنێ
واش دەست و تفەنگی ئێمە، بەخوێنی سوور
یاسای دەوڵەت، لەبۆرژواکان دەسێنێ
دەوەنی گڕ، ئەگەر لەناو هەرچی زەوی و کێڵگەکانی
چەوسانەوەو ئازار هەیە

بەهۆ هۆی دەنگـو حەیرانی ئێمە بڕوێ

گەر تەبارەی هەرچی جامی ژیان هەیە

ئێمەی سەپان دروێنەی کەین

ئەگەر دەستی جوتیاری دێ

بەشەنەبای خەرمان بسوێ

بۆچی هەرچی تەمبەڵ هەیە

سواڵکەر نەبێ

بۆچی هەرچی ماندو نابێو حەساوەیە

لەژێر دەستی رەنجدەر نەبێ

***

ئێمەی هەژار.. ئێمەی ئازا.. وا پۆڵا دەتوێنینەوە

هەرچی چەکی قورسیش هەیە

رەنجی ئێمە باری دەکا

لەمڕۆ بەدواوە هەموو ئارەقەی رژاومان دێنینەوە

***

ئێمەی هەژار، ئێمەی ئازا وا پۆلا دەتوێنینەوە

هەرچی خەمی قورسیش هەیە

بەسەر پردی ئێمە دەڕوا

ئەی بۆ خوێنمژ گوللە بێت‌و

لەناو لولەی زامی خۆمان،

تێمان خوڕێ!

بۆچی ئێمە، ئێمەی برسی، ئارەقەی چاو بخۆینەوە

بۆسەر لەنوێ، بۆ راپەڕین

بۆ شۆڕشی یەکجارەکی نەژیێنەوە

ئێمەی کارگەر چاک دەتوانین

ناڵەی هەژار، خەمی کۆمەڵ

لەشەوی تون.. بۆ هێلانەی هەتاو بەرین

ئێمەی هەژار، چاک دەتوانین، لەکێڵگەی خوێن

لەکانی نەوتی ئاگرین

لەسەنگەرا.. دەست لەملی سۆشیالیست بین

چاک دەتوانین، لەمردنیش یەکسان بژین

***

**ئێمەی هەژاری پێشمەرگە کلاشنکۆفی برسێتیمان**

**توپی تینووی دیلێتیمان،**

**دەڵێ: ئالای رزگاریمان، با دژی چەوسێنەر هەڵکەین**

**لەخاکی شۆڕش و تفەنگ، هەرچی چەکی کارگەی سوورە**

**لەکوردستانی کارگەران**

**دەبا بڕۆین.. بڕۆین لەگەڵ ئاوازی جەنگ**

زەڵێ ۱۸

# خۆری برسی بەهیچ

## هێری داناگیری

گەر بەرزایی چیاکانمان

وەکو چەکی ماشینێ رێ قەدو باڵای کپ بێتەوە

گەرئازایەتی پێشمەرگە، وەکو شەپۆلی روبارێ

ماچی کەنار بکاو بنوێ

ئاو مارکـای خوێن بگرێتەوە

ئەوسا لەچاڵی دەشتی شەو

رەگی ژانی بەرزێتیمان،

لەقولایی برسییەکانا دادەچێنین

ئەوسا بیری ئیرتوازی

لەناو کێڵگەی هەستی هەژار هەڵدەکەنین

ئەوسا بازارِ، کۆڵان، شەقام.. دەگرێنین

دەرگای بەهار دەکەینەوە

گەنمو تفەنگ. رزگار بوونی چەوساوەکان

بۆ خێزانی شەهیدەکانی ئەبەینەوە

***

ئەگەر لوتکەی هەژارەکان بەرز نەبێ

ئەی چی بەرزە؟

دیارە چاڵی بورژواکان

سەربەرەو ژێر، بەرزیی تیایە

دیارە کۆشکی سەرمایەدار

رەنجی گیانی کرێکارەو

ژانەکانی بەرزی تیایە

ئەگەر پێشمەگە برسییەکان ئازا نەبن

کێ ئازایە؟

دیاره زاتو دەست بڵاوی دەوڵەمەندان
سەرمایەی ناو کۆگاکانیان
خوێنی ئازایەتی تیایە
***
کە گلێنە
سپێنەی چاو دەکا بەهێلانەی بینین
کە هۆشیاریی
سەنگەریی مێشک دەکا بەفرگەی راپەڕین
هەتاو بەخۆی ئەسپی رێگا، ئالیک دەدا
روبار بەخۆی، خوڕەی دڵی شۆڕش دێنێو
گوللەی شەپۆل
چەپڵەی سەرکەوتن لێدەدا

زەڵێ ۱۹۸۰/۳/۲٦

# وشە گوڵەکانی
# پێشمەرگەی شیعر

ئێوارەیە.. چاوی سووری روناکیی خۆر
بوخچەی زامەکانی ئەمڕۆی
لەکۆچێکا پێچایەوە
ئێوارەیەو، دیسان شەڕە تەقەی رۆژمان
بەڕێ کردو،ئەو شەوەی کە خۆشمان ناوێ
بۆ باوەشی ئیسراحەتمان رژایەوە
قاچی سڕمان.. بەپێڵاوێکی قوڕاوی
بۆ ئەم گوندە هەنگاو دەنێ
١٠ پێشمەرگەین

شەو میوانی خەمی مزگەوتی ئەم گوندەین
تاجوتیاران.. بۆگیانی سەرما بردوومان
هەندێ گەرماییمان بەنێ
***
ئێوارەیە.. ئەسپی پەرۆشی لاوی دێ
بەگوڕ تاوی خۆشەویستین
بۆ ژانی گیانمان
(چاوم کوێر بێ)ی دڵ گریاوی هەژارەکان
کۆرسی سارێژی دەروونەو،
دیارە، دیارە رەنجی ئێمەی پێشمەرگەی سوور
لەم دیهاتانە پێدەگا

ئێوارەیە..

خەڵکی لادێ

وەرن چاومان

لەخوری گیانبازیتانا

دنیای برسییەکان دەبینێ...

وەرن دڵمان

لەناو خوێنو برینتانا

گڕی تینوی جەنگی گەل دادەگیرسێنێ

زەڵێ ١٩٨٠/٢/٢٦

# بۆ! بۆ! بۆ!

دورگەی مانگی ئەفەریقیا[*]

میرنشینەکانی چیا

ناوی خۆیان لەسەر نەخشەی گێتی هەڵکەند

ئەی بۆ ئێمەی ملیۆنەها

دەیان ساڵە ژانی هەژار، دەگرییێنین

ژەمێ نان و.

مافی رزگاریمان نەسەند!

زەڵێ ٢٩/١/١٩٨٠

---

(*) مەبەست لە (جزر القمر)ە.

# وەڵامی نوێخوازێك

وتیان، وتمان، نوێمان دەوێ

ئێمەی نوێخواز، نوێمان دەوێ

تاگیانێكی گەرمو چا و تیژمان دەسكەوێ

تاكو بەچكەی بێشكەی ئەمڕۆ

بەئاواتەوە، ماچ بكەین

لەبازاڕا.. دەسترازەی كۆن، هەراج بكەین

***

دوێنێ لەپێرێ، نوێتر بوو

كاكم لەباوكم جوێتر بوو

ئەگەر پێرێ خوێنیان دەڕشت

بەڵام دوێنێ..

بەبێگاری خەڵكیان دەكوشت

دوێنێ لەپێرێ نوێتر بوو

ئەی بۆ هێشتاوەك جارانین

دیارە ئێمە.. بانگی نوێخوازی نازانین

# نەمتوانی...

ویستم واز بێنم..
لەیادکردنەوەی ژینی لاساییم
یا کەم بێمە لات، ناوت کەم بێنم
چونکە لەگەڵتا یەکبووی ئاساییم
ویستم وابڵێم کە ژینی پێشووم
هیچ نەگۆڕاوە، وەک روو سووری رووم
بەڵێ وام ئەویست،نیگەران نەبم
وەک گێژەلووکەی، دڵداران نەبم
ویستم پێکەنم، شادبم، مات نەبم
خەمخواری واتەی وشەی (لات) نەبم
چی بکەم نەمتوانی! گیانە کەم ئازار
هەستی وروژاو بەجۆش کەوتە کار

بۆ بیرکردنەوەت، بۆ بینینی تۆ

زوو زوو هاتمە لات هەر بۆ گفتوگۆ

چاوی دڵ بووە، ئاوێنەی باڵات

تا فریشتەکەی تۆی تیا بنوێنێ

تا لە پارێزگای دڵ یا هەر شوێنێ

لەبەرچاوا بێ

تا بەکفکفەی خوێنی کانی دڵ

ئاو بدرێ چڵی خونچەی سووری گوڵ

١٩٧٠/٤/٢٧

# وەڵام

گیانە نامەکەت...

نامەی سەرکۆنەو کاری زامەکەت

بەدڵ خوێنمەوە پتر لەجارێ

نمە فرمێسکم بۆی کەوتە خوارێ

جۆشی سکاڵای ناخی دەروونت

دڵداری روونت..

پاڵی پێوەنام

تا دەربڕم هۆی قوڵی و کوڵی زام

سەرکۆنەم مەکە تاکە نازدارم

بۆ دەرنەبڕینی وتەی تەڕ شیرین

وتەی ناسک و پڕ سۆزی دێرین

جا دڵنیابە..

چاک دڵنیابە، خۆشەویستەکەم
شەیداکەی دوێنێو تۆپەرستەکەم
بەڵام گیانەکەم
ئەوەی ئەبیستم،هەرچی ئەبینم
ئەوەی تووشی بووم
ئەی گۆشتی، تەن‌و دەماری ژینم
ناچاری کردووم..
لەجیاتی وشەی پڕ (خۆشەویستی)
یادی رابردوو رۆژانی مەستی
وشەی (پەرستن)
(ئەندێشە سوین لەلەشی کوشتن)
چەند وشەیەکن ترسناک مەبەست
(نەڕە)و (زرمە) بەهەر (دەنگ‌و تەقە)
هەر باسی (راستی)و (هەڵە)و رێی (هەقە)

(برین‌و درین). (مردن‌و گریان)
ڕێچکەی هاتوچۆ بۆ سەر کوردستان
وشەی (کوشتن)و (ئاگرەو ئاسن)
مێشک‌و دڵ‌و گوێ لەوانە کاسن
بۆیە گیانەکەم، چیت بۆ بنووسم؟
ئەو سروشانە بۆ من هەوێن بن.
یەک لەیەک پتر وا دڵ تەزێن بن
چیت بۆ هەڵبەستم..؟
چۆن ئاودێری کەم بەسۆزو هەستم؟
بێمەوە دۆخی وەک هەرزەکاریم:؟
لەبیرکەم هەستی نەتەوایەتیم؟
بیخەمە ئەولا گشت کوردایەتیم؟
لەپێناو تامی کۆستی دڵداریم..!!
زۆر چاک بزانە من گۆشت‌و خوێنم

چۆن تۆ پەرست بم مەرگیش بدوێتم؟!
خۆ (ئەمۆنیا) نیم..!
ماوەی چرکەیەک ببمە ئاوو گاز
لەژینی خۆشم زۆر دڵنیا نیم
تادەست لەمل بین لەباخی مراز
ئازیز من لاوم:
جەزرەبەو دواوێ کەتێی ئاڵاوم
یا ئەو دەردانەی گەڵ گیرۆدەی بوون
ئەمانبەن بەرەو گۆڕی لەناوچوون
پێویستی زۆرە! بەیارمەتی تۆش
لەگەڵما وەرە، دڵت بێنە جۆش
نەک بۆ مەبەستی وشەی (دڵداری)
بۆ رابواردن یا بۆ گریەو زاری
بەڵکو بۆ (خەیات)

باخۆشەویستی..

وەک مەشخەڵ بێ بۆ رزگاری وڵات

دەس لەناو دەس بێ..

سەرکۆنەم مەکە، ئیتر بابەس بێ

شادیو بەختیاری گەلو نیشتمان

بابێتە بەری رەنجی تێکۆشان.

***

# فرمێسکی ناو لۆچی ئاڵ

کیژۆڵەکەی شارستانی
منی لادێی کوردستانی
خەناوکەکەی.. ناخی زەوی
دەئاڵێنمە...
ملی کارگەی قەندی شارت
تاپێ بگا.. تابرِسکی رەنجی پارت
***

کیژۆڵەکەی شارستانی

منی لادێی کوردستانی

تا تەمەنی هەشت نۆساڵی

لەگوندێ بووم..

بەکلیلی دەرگەی خۆرم نەدەزانی

رێبوارێکی ماندووی رێبووم

هەموو ساڵێ...

رەنجی باوکم هی باپیرم

دەپیورا بەربەی رەنج خۆر

جەواڵی خەم.. بار دەکرا لەگیانی پرسوێ

بۆ بارەگای چەوسانەوە، دەبرا بەزۆر

بۆ ئەوجێیەی.. تا ئەمڕۆکەش

مافی توورە، لەوێ دەدوێ!

جا گیانەکەم، لێم بوورە

لەو نەریتە نایلۆنییەی

گیانی ئەو مردووە برسییەی

لەمنت دەوێ

ئەو ژیانە.. لەمن دوورە

***

کیژۆڵەکەی شارستانی

دەستگیرانی.. منی لادێی کوردستانی

تۆ واز بێنە لەژیانی بورجوازیت

لەبیرت چوو خۆشتەویستم؟

لەبیرت چوو، وشەی ناخی هەزار خوازیت؟

دەوازبێنە

لەئاڵۆزیی بیری دوێنێ

لەو گۆرانییەی..

هەستی زیندووم دەگریێنێ؟

دەوازبێنە.. لەئەندێشەی کۆشکـو تەلار

لەنازی نێو.. جانتای دینار

دەوازبێنە.. دەوازبێنە.

***

# چەپڵەی ژێر دەواری زام

کاتێ مرۆڤ هەڵگڕایە ئەستێرەو مانگ
خواستی ژینی سەدەی بیستی یەکالاکرد
بۆ رزگاری لەدیلێتی هەزاران بانگ
بەهێزو برِی یەکسانی..
دەرگەی سەربەستی والاکرد
بەلام کاتێ
گەرِامەوە بۆ شارەکەم
دیتم، بیستم لەوولاتە وێرانەکەم
گەشتەکانی خەو بینینی ئالۆزکاومان
لەژێر لێفی خۆ حەشاردان
بویتە حەزیاو تانەی چاومان
مووچرِکە لەژێر سەرین‌و جووتێ باڵمان
مات‌و موورِو بێدەنگ مایە!
خێوی درۆی هیوای هەرگیز نەبینراومان
بەچیرۆکێک ئاخنرایە گوێی مناڵمان

## لەبەندیخانەی دەربڕینا!!

دەستی نهێنی
درزی پشت پەردە
گورز ئەوەشێنێ
بچرپەو لرمەی لەهەموو شوێنا
مەلۆتکەی زۆر جێی بەئاگا هێنا
ئاوێنەکانی پەنجەرەی شکاند
شەوی روو رەشی کردین بەگژا
کەوتە شارەکەو بۆ ژوور خۆی خزاند
دووکەڵی مژی جگەرەی دەمی
تیشکی رووناکی ناوی هەڵلوشی
لەکەی (چوار) پەنجەی رەش بەمەرهەمی
وەک جل پێ پۆشی...

جا لەجەرگەی شەو

دیلی کەڵەپچەی لای دەسبێنی خەو

لەسینگی رەشا، بەچەندین نزا

گێلانە گەڕان لەکۆشی دزا

یا چاو شارکێی ژێر شاخ‌و دارو چیا

دەس لێوەشاندن

دووبەرەکی‌و جیا..

ئەوانە هەمووی...

لەهەوێرێکا.. گەنمی لەکیش چووی

کردە پرپۆڵەی جووجوڵەی دوژمن

***

چاوتێر نەبووی خوێن

بەئاوازێکی نزمی هەست بزوێن

کە (سینگ ئەکوتێ‌و جارێ سینگ ئەخوا)

یا بۆ پووڵ ئەگری..

کوا ئەژی؟ ئەمری

چونکە جەستەی بێ جلکـو نان دوا

گلۆڵەی لێژە، هەر ئەبێ بمرێ

***

بەو گەردەلوولەی.. تەمی هەناسەی گەرووی دوژمنە

سیی جەستەمان پڕ (ئۆکسجین) ناکا

بەو سازە زرەی هی تانکـو تۆپە

بانگی ئازادیو ئاشتی ژین ناکا

لەگوێچکەمانا، هەر زرپـو زۆپە

کۆترەکەی راستی، هێشتا هەر ونە

ژووری زستانی کورد هەمووی کونە

نوزەی نەخۆشی، دەستێکی لەرزە

ئاڵای سەربەستی پێهەڵنابڕێ

بەقیژەی مناڵ یادەنگی هەرزە

بەڵێ، بەم جۆرەش دەنگ دەرنابڕێ

***

درزی دیواری یەک ماڵو خێزان

سواقی پەنجەی چڕ، پیا هەڵسوینی جوان

زۆر بەدڵسۆزی، ئەبێ دایکی بێ، تاکو پڕیکا

ئەو چاوەشانەی هەر لەسەر شانۆن

دەهۆڵی شەوی دەس قالۆنچەی کۆن

دەنگی نەوەی نوێ ئەبێ کڕیکا

***

لەشکری هەستی دەم بەمزکێنی

ڕۆژ ئەجولینی

ساتمە کاروانی شۆڕش بەرەو خۆر

تارمایی شەوی ڕێگە ڕاوئەنێ

چاوی بەیانی هەڵدێنی بەزۆر

ڕۆژی زگاری بۆ کورد ناو ئەنێ

***

# هەر لەبیرمە

-

سروشت ئەمڕۆکە شێواوە
دڵێک لەجووڵە وەستاوە
پەڵەی هەوری ئاسمانی شین
وا لەداخا کردی بەشین
لەبەر بێداری خوێن مژان
زەمینیان خستۆتەهەژان
لووتکەی سپی...
بەڕەنگی دوانی زۆر کپی
بەدڵۆپێک خوێن تواوە
دڵی (کورد) خوێنی تێزاوە
هەستی گەرووی شمشاڵی خەم
لەگەڵ خوڕەی خوێناوی چەم

دەروونی گشت لاوێکی مەرد
لێی ئەپروشکی گڕی بێگەرد
هەموو سەرجەم
وتیان: خامە رابەرمان بێ
بۆ (شین)ی لاو نوێنەرمان بێ
منیش پێنووسم خستەکار
بۆ هەڵوێستێک، ناسک، نازدار
بیروسۆزم بۆی بوو دەرفەت
تا هەڵڕێژم ئاخ و خەفەت
تێکەڵ کڵپەی گەرمی خەبات
کردمە تابلۆی بەرزی ئاوات
بۆ پاڵەوانی (پێشمەرگە)
بۆ ئەو لاوە جوانەمەرگە

کە گوللەی نوێنەری چەپگەرد

وەستاندی، دڵی رۆڵەی مەرد

وەک ملوانکەی ئاهەنگی خەم

هەڵئەواسم یەخەم

جا لەجیاتی گشت هاوخەمم

هاوار ئەکەم پڕ بەدەمم

قەت نامرێ، هەر زیندووە

گەلێ هیوای بەخوێنەکەی ڕواندووە

پەیامی پاکی بردووە

پێشەنگی رۆڵەی خەباتە

بۆ ئەم خاکە

لەو وڵاتە

پەڕەی دڵی کوردی جێماو

بووینە شوورەی بەهەشتی لاو

(جوانترین گوڵ لای بەهەشتی)

کوردستانێکی رزگارە..

کە بەگشتی..

کورد بۆی وێڵ و لەئازارە

هەروەکو خۆی بۆ ئەوە رۆی

بۆیە کە مرد.. نەمردووە

ئالآی کوردی.. نەخشاندووە

جا کاکە گیان گەواهانی کورد بدوێنە

گوڵی سەربەستیم بۆ بێنە

هەولێر ١٩٦٨/٥/١٠

# بۆ رۆڵەکەم

رۆڵە: سەرت نا بەکێلی زێڕین
بەمێژووت سەلماند خەباتی دێرین
بۆ (کوردایەتی) تەمەن‌و گیانت
بەپاک بەخشی‌و بۆ کوردستانت
بەخێوم کردی وتم: بجەنگە
سەرت شۆڕ نەکەی بەم دەس‌و تفەنگە
تۆش ئامۆژگاری دایکی دڵسۆزت
لەگوێ گرت تاکو نەمری بۆ هۆزت
بۆیە ناش گرییەم، سوپاس بۆ خوا
(جەرگم) بەردێکە بۆ پردی هیوا
رۆڵە: وانەبێ تۆمان خۆش نەوێ
هەتا بەڵگە بێ. تاکورد نەسرەوێ

ئەگینا تۆی لاو تۆی جوانەمەرگم

زامێکی گەورەی لەدڵو جەرگم

شانازی ئەکەم کە دایکی تۆمە

(هیواکەی کوردت) جێهێشتووە بۆ مە

هەزار سڵاو بۆ گیانی زیندووی تۆ

ئەی جێگە بەهەشت، قەت نەمردووی تۆ

# تابلۆیەکی کۆن!

مەنجەڵی ڕەش سەر ژیلەمۆی کۆن
توێژاڵک تەڵخی، دەرو ناو پڕدۆن
کەوچک لەداری، نێو سووتاوی خەڵوز
بەدەست دێوێکە، ئەو ئەیکا بەکووز
ڕەش‌و ڕووتەکانی، مناڵی برسی
بەهانکە هاتک‌و نزگرەو پێخواسی
هەموو دەس بەداس..
وتیان: دەی تێکە لەو چێشتە خۆشەی
لەدوێنێکەوە..
پێمان گەیاندو لێمان ئەپرسی
دیتیان هەر دۆنە، ئەو جەستە پۆشەی
بۆ هەڵسوێنەر لەسمێڵی بەراز
ئینجا قیژاندیان، وتیان: خەڵکینە
کوانێ کوردینە؟
نەگەیین بەڕاز!!

# ئاهەنگی شیعرێکی گەڕۆك

کاروانی.. سەردانی شیعر
لەپێرێوە.. کەوتۆتە رێ
لەنیوەی شەو.. زەنگی پیتی وشەی ئاگر
دیتی،خەوتووی مەزاری ژان
لەگۆڕستانا، پرخەی دێ
لەشکری شەو.. دمس بەخەنجەر
بۆ بەربەستی هەڵهاتنی خۆر وەستابوو
تفەنگی ناو پێکی ئازار
لەئاگردانێکی وەستابوو
***

لەڕێگادا.. شیعری نەشمیل

خێرا، شووی کرد بەتێکۆشان

خەمدانی کورد..

لەئاهەنگی رق خواردنا

لەئاهەنگی بەرەو سبەی سەرکەوتنا

بوو بەدەهۆڵ.. کەوتە جۆشان.

کە خۆر هەڵهات...

گوڵێکی سور.. دەنگی هۆنراوەی هەڵهێنام

رۆڵەی بێشکەی شیعری بڕوا

ناوی (ئامانج) یان بۆ لێنام

هەر لەڕێگا...

وتیان: زۆری، وەکو (عیسا)، هەڵواسرابوون

گیانی (مهاباد)و (کەرکوک)، ئەنجن کرابوون

هەر لەو کاتا..

دڵی زەنگی کاروان هێشتا ماتە..

باستیلی شار.. سپارتاکۆسی تیدا قاتە

***

هەر لەڕێگا..

لەتینوێتی

گەرووی چرای تاریان پرسی: بۆ بێ ئاوی؟

وتی: ئاخر! دیجلە، فورات، پڕ لەزێروون!

***

چەند خۆش دەبوو..

لەدەشتی بیر.. کەخۆری لێئاوا نابێ

خێوەتێکمان هەڵدابوایە

چەند خۆش دەبوو..

زگی شۆڕش نانێک تێری بکردایە

نەک وەکو ئەمڕۆ..

بۆ چەندین جار حەواڵەی کۆشی خوا بوایە

***

ئای چەند خۆشە..

بەئاو.. وەڵامی تینوێتم بدرێتەوە

ڕەوایە..دەرگای شەویش.. بەڕووناکی بکرێتەوە

١٦/ئاب/١٩٧٢

# وەڵام.. بۆ ئاگردانی شۆڕشێك لەزستانا

لەبیابانی ژینی زگ برسی
زستانێ بووم.. سەرمای خۆمم کوشت
لەداخی ژانی ئازاری پڕ مەترسی
ئای کەچی بکەم،
دایکی بیر، تاکە رۆڵەی سکی خەم نیم
رۆڵەکەمیان بردو کوشتیشیان..
بەکوڵ هەستم لەگەرمای چاو بێمە گریان
گریانێک نیم لەناو چاڵی بێبیستم
گریانێک نیم گوێی شەوی کەڕ بدڕێنم..
گوللەی گەرووی تینوییەک نیم
مەلی سنووری خنکاوی کەلاکی گیان

بەرووی چەقۆ هەڵفڕێنم

ئای کەچی بکەم..

لەبیابانی ژینی زگ برسی

زستانێ بووم.. سەرمای خۆمم کوشت

لەداخی ژانی ئازاری پڕ مەترسی

ئای کەچی بکەم

تیشکی خۆری هاوین نەبووم

سەری کەچەڵ هەڵقرچێنم..

شخارتەی دەس سەرما بردووی زستان، نەبووم
لەجامیلکەی گڕو خوێنا..
لەفری زیوین، بسوتێنم
ئای کەچی بکەم..
وشەیەکی ئاگرین نیم
وا ئەو یارە لەباوەشی پۆستەبەری ئەم بەهارە
خەنجەرەکەی لەهەنیسکو میکرۆفۆنی لەگەریانە
پەلاپیتکەی تفەنگی ژان
سێرەی بۆ سینگی زیندانە
چۆن ئای چی بکەم
ئەی ئەوەتە..

دەسکە جۆنی دەستی خەم نین

قینی زیوان لەگەروی دڵ ناکوتین

ئەی ئەوەتە، کەژی ئاشی

خۆی وا بەخۆی ناڵێ، شەتین

ئەی ئەوەتە.. کارێزی گڕ هەوای بێدەنی نامژێ

بەردە دڕی گوێچکەی بوونی ئەو مەرگە نین

چۆن ئای چی بکەم..

شخارتە نین

بەدەست پەنجەی چەوساوەکان

وتەی گڕین..

بەدەم هاواری لاوەکان..

شەماڵ هەوری زگپڕی دایە بەرقاشۆ

بەچکەیەکی ژیرمان دەبێ، موژدە لەتۆ

هاکادیت

گوللە، تەمی ئەو زستانەی رەواندەوە

رووناکی، ئارەقەی بازووت حەواندەوە

برای تفەنگ.. هاکا دیتت

شان و شەپیلکی ماندوێتی

باخەڵی لەشی سەرما بردووی، بەخوێن پڕ کرد

هاکا دیتت، لافاوی چاو..

ساڵی (هات) زۆردارانی بەزۆر قڕکرد.

١٤ ١٢ ١٩٧٢

# هەتاو لەناو دەریاری
# خۆشەویستیدا

-١-

لەهەورازی، بەرەو خۆرا..
کاتێ خەوتن، لێمان تۆرا..
ئۆتۆمبێلی،رێگەی پێچی خانزاد وەستا
بەئەسرینی دواکەوتنا.. لافاو هەستا
قەڵای رێگا.. ئەشکەوتی چیا..
رووباری خوڕ
مەنەلۆجی کیژی سەیران.. لەلێوی کوڕ
هاواریان کرد.. خانزاد لەکوێی؟
خانزاد لەکوێی..؟
وا بریسکەی باخەڵی چیای تۆیان سووتاند

کاسەی چاوی نەوەی تۆیان، بەخوێن گریاند

خانزاد لەکوێی؟!

چاوی کچە نەغەدەییان هەڵکۆڵیوە

دەیانی وەکو قەدەم خێریان کرد بە پەتا

گوڵی گەنجیی زۆر لاوی وەک جووتەبرا

لەبەهارە هەڵوەریوە

***

-٢-

خاتوو خانزاد:

باخی شانۆت

گوڵی ئێمی لێبۆن دەکرێ

رستی جل شۆرینی دڵم

دڵۆپی سووریان لێدەتکێ

خاتوو خانزاد

کوا ناتبینم؟!..

کەللەسەری سوپای یەزید

لەدیوانی قەلاکەتا.. کۆیتەو

کوا ناتبینم؟!..

مەمکی تورتت..

لەگرەوی چنگی زۆردار بەریتەوە

-٣-

خاتوو خانزاد.. نازانی کێم؟

ئەو برینەم..

لەلەشتانا، تەشەنەبووم:

ئەوکۆترەم..

هەزارەها شالووری خەم

لەناو زامی باڵەکانمان..

سردووی پێشمەگە دەڵێن

خاتوو خانزاد

ئاسۆی مەندی،خوێنی سبەم:

بوویتە چاوی سەدان بەڵێن

***

-٤-

خاتوو خانزاد... نازانی کێم؟

ئەو کاروانە، دونیا دیوەم..

لەڕێی دوورا.. ئەسپی وورەم پڕتاو دەکا

نازانی کێم...

ئەو ئاگرەم...

بەربویمە جلکی ئەو کەسەی

ماسیی هەقیقەت ڕاو دەکا

٢٢ ١ ٧٣

# ئەم وێنانە ئەمڕۆ میوانن

ئێوارە بوو، خەندەی ژانی چرۆی دەم کەل
چۆکی نایە دەم سنووری شەوو رۆژو
وتی: ئەی رۆژ دەبێ هەر بێیت..
باڵی گریاوی مەلی مەم
بخەینە مل دەستگیرانی سازی بێتەل
ئێوارەبوو، رووباری پڕ لە شوورەیی
وتی ئەی رۆژ دەبێ هەر بێیت
دەنا رووبار لەبارانت پڕ ئاو ناکەین
دەنا.. دەنا
بەرەو بەرزیت پڕ تاوناکەین
*

**تیشکی گۆمی ژێر مانگەشەو وتی، وتی:**

**دەبا کاروانی بێدەنگی چیتر پەنا بۆ غەریبی**

**ئەمساڵ نەبا...**

**چیتر فەرشی حەسانەوە لەناو ژووری**

**هەناسەی ساردا رانەخا..**

**چەقۆی رووناکی مانگشەو وتی، وتی:**

**ئەو مەلەی کە تۆوی بێستان چینە دەکاو**

**دەشتەکانمان وەک هەتیوی بیابانان**

**لێناگەڕێم.. تیغی راوی جارەهای جار دەسوومەوە**

**دەبێ هەر خەم لەمەشکەی تینوو راژەنی**

# ئەمبەی بەدواتا دەگریەم

گیانە، گیانە..

چلەی زستان.. رووت‌و قووت بم

ئاگری خۆشەویستی تۆ، لەناو گیانە

قرچەی هاوین..

گەر چوار دەوریشن دۆزەخ بێ

لەشم ئاگری کوێستانە

گیانە گیانە

خۆشەویستیم، پەڵەی داوی

ئەو بەچکەیەی

سەرکەوتن شیری پێداوی

گیانە بمبە..

گەر میوانی خنکانم بی، لەگەڵتا دێم
گەر خۆت، تەوری لێدانم بی، لەگەڵتا دێم
دەبێ بمبەی.. بۆ ناو دڵێ..
شەمەندەفەری سەردانی.. وەرناگەڕێ
هێڵی ئاسنینی بیری.. لەناو گەنمی سەپانایەو
هەر نابڕێ، هەر نابڕێ
گیانە بمبە، لەگەڵتا دێم
بۆ هەر شوێنێ.. گریان قامچی یاساوڵەو
پێکەنینی تیا زیندانە
گیانە بمبە.. بۆ کێڵگەیەک بێبارانە
بمە بۆ ئەو هەزارەی بێدەسگیرانە
لەگەڵتا دێم، لەگەڵتا دێم
بمبە، بمبە، دەبێ بمبەی
تاکو ژانی زامم ماوە.. نەکەی تۆخەی

# نیشان

بەپەنجەکەی فریشتەی خوا..
مەرەکەبی پێنووسەکەی خوێنی دڵ دوا
نووسی: ئێوە نیشان کران، بۆیە کترن
فەرموون بێخەم دەی دەستی یەک بەجووت بگرن
لەو باخچەیەی هەزارانی وەک ئێوەی تیا
بەبەختیاری، بژین، بژین، زۆر دڵنیا
دەست بەرستی مێخزنجیری تون داکوتراو
لەو ژینەی پڕ درکو داڵەو هاژەی لافاو
ژیرانەو پاکو وریاو گوێ سووک رێگە ببڕن
لەکەژاوەی داهاتوودا، ئاسمان بدڕن
هەمدیس نووسی: دوو دڵ بەسترا..
دوو جەستەی پاک بۆ یەکتری مەرەخەست کرا
لەباوەشی گەرمی باوکو دایکی نازا
بۆ ژینێکی تازەی (جووتە) لەکار ترازا
(رەنجبەر)انە لەژنێکی پڕ لە (ئازار)
تۆڵ بکوتن: بۆ کۆرپەی نوێ بکەونە کار

١٩٧٠/٤/١٧

# بنەگەی شوانکاری

ئۆپەرێتێکی یاری منالآنەیە

٢٠-٣٠/٨/١٩٧٨

**تابلۆی یەکەم**

(دێیەکی وشکـو بێئاوە.. سێ چوار منـاڵ عوسـەو شێرە، رەشـە، بەرچاو دەکەون)

دەنگێ: (لەسیلەی قەبران هاوارە

دادگا بمدا لەسێدارە

دانانێم من مەیلی ئەو یارە

وەرگەڕێ باڵات های ببینم

بادەرچێ رۆحی شیرینم

عاشقان لەدوورەوە دیارن

رەنگ زەردو لێو بەباران

مەنعیان مەکەن خاوەن یارن)

عوسە: (بەراکردن دێتە گۆڕەپانی دێ بەئاوازەوە ئەمە دەڵێ)

هەرە لەقە هەرە لەقە

پەرِم وەک حاجی لەقە لەقە

هەرچی نایەتن بۆ گەمان

لەماڵ بەشی شاپ‌و شەقە

شێرە: (مناڵێک سەر دەردەکا)

زەردە خۆر هێشتا هەر ماوە

زگی برسی کزو خاوە

باتاریکی قینی بڕژێ

شەمشەمەکوێر هەڵسێ‌و بفڕێ

بۆ کەل بۆ کەل

مناڵ کوڕ گەل

بەرووی بەیانی هەڵدەگژێ

رەشە: هاتم هاتم

نووردیە نانی خۆم دێنم‌و

عوسە، عوسە زوو لاتم

زرِباوکی ماڵ

خۆی دەمنێرێ بۆ ناو مناڵ

هەرە لەقە، هەرە لەقە

بەم ئێوارە، چاوم زەقە

لەئێوە بێ هەزار  سڵاو

دانو دەخۆن، یاخو پڵاو

عوسە: دانوو، دانوو

مەنجەڵ دەخەینە سەر ئاگر

گڕ دەکەینەوە سەر لەنوو

شێرە: دەبێ پێکی منیش بکەن

هەرچەندە زۆرم خواردوە

پرسی باوکم نەکردووە

تاخەوم دێ

ئەستێرەتان بۆ دەژمێرم

بەگورگـو رێوی دەسپێرم

رەشە: دەدانیشن.. کوڕ گەل هاتن

(کۆمەڵەیەک دێن)

بەڵام ئەگەر.

کوڕی ئاغە لەگەڵدابێ

تامی نابێ

فەرهاد: پەرتەی لێکەن.. خۆتان بگرن

بەفێڵ بەشەق.. دەری دەکەین

تایارییەکانمان سەردەگرن

عوسە: ئەو بەگزادە
هەرخۆی نایە..
زۆریش رقی لەفەرهادە
بەلام تاوەکو بۆی بکرێ
یارییەکەمان لێتێک دەدا
زۆر وریابن
جارێ کەس جوێنی پێنەدا.
شێرە: (کوڕ کوێخایەو دەوڵەمەندە)
منالینە دڵ رەق مەبن
لەناوە خۆ.. فێری لێدانی شەق مەبن
(هەموو کۆدەبنەوە)
هەموو: یاری ئەمجارەمان جیایە
کوڕی هەژارانی تیایە
هەر منداڵێ تێکەڵمان بێ
دەبێ مەرجی گەمەی ئەمشەو
بکاتە کوڵ لەگەڵمان بێ
رەشە: دانوو دانوو
گڕ دەکەینەوە سەرلەنوو
(دەستو پێیان درێژ دەکەن)

فەرهاد: حلول بلوول تەکامە

زەردو سوورو شەمامە

عەیشێ باوان.. لەخۆشناوان

دەگرێ چاوان

چاوی بەگو..

پێم تێهەڵچو..

عوسە: (شێرە تێکەوت لەو یارییە)

شێرە.. شێرە

پاشکۆی دمۆر بەتۆفێرە

تۆ خەوت دێ

تەبەیانی ناگەیتە جێ

فەهاد: پاڵدم بەستم..

گەر نەچیەوە.. بۆ کوێ بڕۆی

هەر دەتبەستم

ڕەشە: دەدەستی چەپتان هەڵبڕن

ئەی ئەوانەی فێری گڕن

هەموو: هەرە لەقە هەرە لەقە

چاوی برینم زۆر زەقە

هەرچی نایەتن بۆ گەمان

لەوێ بەشی شاپو شەقە

(کەمێ وەستان)

دەڕۆین بەرەو قوتابخانە

کەئەوێ سەرچاوەی نانە

خوێندەواریو زانستی نوو

گڕە بۆ مەنجەڵی دانوو.

## تابلۆی دووەم

(گەڕەکێکی، شارە منداڵی جوتیارە دەرکراوەکانی گوندانی تیا دەبیندرێت، ڕێباز، هەریار، شاسوار، شۆڕش، عوسە، ڕەشە، فەرهاد)

تەمی زوێری گوندەکان

لەچاڵاوێکی کوندەڵانا

ئاغەو چەقەڵ

خوێنی چینە رانیان دەخوارد

لەقەرسیلی دەشتو دۆڵا

باب هاتن.. وەک دێڵە سەگ

رایان دەبوارد

کۆچی جوتیار..

بارگەی نایە ئەسپی ئاوات

بۆ شار هاتن.. بوونه کارگەر

تاچەکوشی داهاتوویان

خەمی دەرکردنیان لابات

هەموو: هەرە لەقە.. هەرە لەقە

چاوی برینمان.. زۆر زەقە

ڕێباز: دایکم دەیگوت

گورگی شەوێ.. گورگی شەوێ

یاخوا لەماڵمان دوور کەوێ

هەریار: دایکی منیش پێم هەڵنەگوت

هەمووجارێ زوو زوو دەیوت

زاوای خاڵتان..

بێنە ماڵتان

زۆر کەس هەیە هەر راوی دەنێ

هەریار ئێوە چی دەدەنێ

ئێمەش وتمان:

تۆی دەدەینێ

دەست لەمل بن تا سبەینێ

هەموو: (پێکەنین)

هەریار: دایە ماچی دەکردمو.. پێدەکەنی

وتی: خۆزگە باوکی ئێوە

لەبەندیخانە بەردەبوو

ریشەی خەمو غەریبیمی هەڵدەکەنی

فەرهاد: ئێمەی بێباوک

ئێمەی هەتیو

لەشارا بێپەناو پەسێو

رێباز: باباخی گوڵ.. دەی پێک بێنین

گڵو ئاو.. بێڵو چەکوش

لەگەڕەکی کۆن بسێنین

هەموو: ئەم زرِبابە..

لەماڵی خۆمان دەردەکەین

بەردەقانیو دارلاستیکی

چی منالّی جوتیار هەیە..

پاسەوانی..

کێڵگەی گوندو.. تۆمان دەکەین

عوسە: عەسکەرنیم مەشاشم بێ

پۆلیس نیم رەشاشم بێ

مەلا نیم زەکاتم بێ

ئاغە نیم دێهاتم بێ

شێخ نیم کەرامەتم بێ

داوم کەوتۆتە داوی

زەحمەتە نەجاتم بێ

کۆمەڵ: (رەوە منداڵێکی شارستان وەڵامیان دەدەنەوە)

هەوێزی مەقشپل نییە

زامی پشتو بن مل نییە

رەیخی تفەنگە عوسکەیە

ئەستێرەمان، تروسکەیە

فەرهاد: دووجاو.. چەقۆو قۆچەقانی

باشتر نییە

لەتفەنگی جڕناو فڕنای

شانی پیاوی پێپەجانی

شۆڕش: مناڵە خۆشەویستەکان

نێوەشەوبوو

چاوی تەلار پڕ لەخەوبوو

باوکی مەزن گەڕایەوە

باوکی بەردەمی سێدارە

کەهاتەوە..

هەرچی لەشکری گڕ هەبوو

هێنابوویەوە، ئەم شارە

زڕباب تووتە

برای تووتە

مام سەرسپیو باڵابەرزە

ئەسپی کوژەو دۆشاو مژە

کەشەو باوکم گەڕایەوە

خستیە گوفەکی مێژوو

مەنجەڵی دانوییان هێناو

گڕمان تێبەردا سەلەنوو

هەموو:

هەرە لەقە هەرە لەقە

کاروانی مە دوورو زەقە

هەرچی نایەتن بۆ شۆڕش

لەوڵاتا.. لەژێر شەقە

### تابلۆی سێیەم

قـەدپاڵی کێوێکـە.. هـەمان کۆمەڵـە مناڵـە بەرامبەردێیـەکی چـۆڵ و خامۆشن..

دەنگێ: «هەبوو نەبوو

شێخ ژنێ بوو

بەبووک نەچوو

مناڵی بوو

جاشووی کرد بە..

جوولەکەیەکی دەوڵەمەند

مێردەکەی مرد

چاڵی بۆ سامانی هەڵکەند

وڵات زۆری موڵکی ئەوبوو

لەو هەموو پارەو دارایە

«خانی چۆڵە» ی جێگەی شەوبوو

هەموو خزم و ناسیاوانی

کەلاوەکەی ئەویان نەویست

شۆڕشێکیان دژ هەڵگیرساند

خانوویەکیان لێدامەزراند

بۆ هەموو لایە پڕ بەپێست

هەموو: هاوار هاوار هاوارە

لەشکر سەدان سوارە

دێ دێ

گشت رێ

دۆڵو رووبار

ژوانی دڵدار

ماتو کزە

جێی رەوە کۆترو مامزە

رەزو باخە دێرینەکان

ماڵی شۆخە شیرینەکان

مناڵەکان

رقی بەزۆر کۆچکردنی

بەختەوەری..

جوتیاری چاوی ساڵەکان

هەوارگەی شوانکارەی لاش

جێ ئەانەی

لەپێناوی برسییەکانا.. خێرا هاتن

هەرچی مناڵی یاخییە

هەرچی خەڵکی ئەم گوندەیە

عەشقی بناری شاخییە

قووچەکی خۆر..

لەسێڵی خوێنا رادەخەن

کۆترو ئاسکـو ئەسپ بەخێو دەکەن

هەموو: تۆڵە، تۆڵە

*سەدان سوارین*

خەمی مێژوومان بەکۆڵە

یاری ریزە میرانەیە

سەدان لاوی پشت یەکگرتوو

بەدوای شوانی خۆیان دەڕۆن

راوە گورگـو راوە چەقەڵ

دەکەن بەخوو

هەریار: شۆڕش، شۆڕش

بۆ دەزانی شوانی بکەی

شۆڕش: بەڵێ بەڵێ

رێباز: شەوین و شیوە خوار دەکەی

شۆڕش: بەڵێ بەڵێ

شاسوار: نانی بۆ سەپانان دەبەی

- : بەڵێ بەڵێ

عوسه: لەگورگـو رێویی ناترسێ

–     : نەخێر نەخێر

هەموو: (هۆ، هۆ هوو هووو)

کاتێ شۆڕش لەلافاوی سەد مەترسی

لەمردنی شوان دەپرسی

شوانە گرە..

بەم مەرجانەش

توانی شوانی هەژارن بێ

لەبەرایی دڵداران بێ

گۆچانی خوێنی گرتەدەست

چەکی نایەشانی مەبەست

## تابلۆی چوارەم

(لەدێیـەکی دەم سـنوور.. شـینو رۆڕۆی شـێخی گورگانـە بەخەنجـەری شوانکارەی زامەکانی مێژوو کوژاوەو شینی بۆ دەکەن...)

پیرەژنێ: هێ دیوانێ دیوەخانێ

کێ بوو پیری ناو دیوانێ

تادوێنێکە میر محێ بوو

عیشقی خوێنی بەبێ خوێ بوو

دار جگەرەی وەک تفەنگی

تانجی‌و توولەی راوو جەنگی

هێ دیوانێ دیوە خانی

کێ بوو یەخەی ناو لاوانە

خەنەی خوێنی هەژارانە

بەجامی ژەهری بێگانە

خۆی کرد بە نیشان‌و تانە

هێ دێوانێ دیوەخانێ

کێیە مردووە لەدیوەخانی

ڕێباز: لاوو هەڵۆ

دیوانی شار..

بۆتە کۆنە ئاشی بەتاڵ

دەستاڕی خەم

بەدەست شۆخی کوڕ مام کچ خاڵ

ساواری ساڵانی ئازار

دیوان ئەوسا دەهاڕێ

هەر مەرگەوەڕو پیرەژەن

شینی مردنی بۆ دەکەن

نووشتەو مۆروو

هەراج دەکەن لەبازاڕی

هەریان: مادام ئێمە یەک ڕێرەوین

ریزی برسییەکانی شەوین

شاسواری مە.. ئاوزنگی ئەسپی لێداوە

ڕێبازی مە

ماندوو بوونی

لەتەرازووی سەرکەوتنی

بێووی چەوساوە کێشاوە

شۆڕشی مە..

شوانەو تفەنگ..

گۆچانی دەستیەتی

شەوین و شیوە خوار دەکاو

لەگورگ و ڕێوی ناترسی

سەرانە نادا بەمیرو

لەهەڕەشەی کەس ناترسی.

# ئەوساکە

ئاهی سۆزی دەروونی تەر
هەڵمژینی لێوی بەفەر
پەلاماری دەست، کتوپڕ
بالاێ جوانێکی هێنکە بڕ
لەگەڵ دڵخوازێک ئەئالا
بۆ دڵداری ئەبووە، ئالا
سوێند بەو گشا دیمەنانە
بەوقژی رەش، هێندە جوانە
بەوشەی (ئا)ی زۆر دڵخۆشم
منیش بۆ تۆ تێئەکۆشم
تا بۆ تۆ بم، تۆش بۆ من بی
بەهیوام چاکترین ژن بی

لەدوارۆژا لەگەڵ منا

لەگەڵ مناڵی خرپنا

لەکەژاوەی بەختیاری

هەر لەگەڵیا بکەی یاری

ئینجا زەوی رۆشن بیری

شانۆیەکمان بۆ پێک دێنی

لەبەهەشتی ئاسۆی ژیری

نەوەی تازە ئەخوڵقێنی

١٩٧٠/٣/١

# ناچیته سەر

ئەی کیژۆڵەی پێشکەوتوو
چەند شیرینی خۆم تێهەڵسوو
ئەو ئاواتەی لەدڵتایە
دڵی منیش بەهیوایە
بەڵام وەرە! فەرموو (رابین[1])
زۆر روونە بۆیەکتر نابین
چونکە منی ماندووی هەژار
بێوچانم بەکارو زار

[1] رابین: فهم

لەپێناوی پێشکەوتنا
لەپێناوی سەرکەوتنا

تۆش پەروەردەی باوەشی ناز
پەروەردەی چەند جۆری ئاواز

بۆیە بەدووری ئەبینم
گیانە کەمن تۆ بهێنم

١٩٧٠/٣/٦

# میوان

شێرکۆ بێکەس

بۆ شاعیری شەهید (جەمیل رەنجبەر)

نیوەشەو هەندێ جار کەشیعر
ئەم باتە ناو دنیای سحراوی خۆیەوە
ئەم خاتە سەر باڵی خەیاڵی دوورە فڕ
ئەوستاتە شاماڵ بێ یان زریان
باران بێ یان بەفر
ئەبینم.. گوێم لێیە:
وادەرگای حەوشەمان
چیرەیەک ئەکات و تۆزێکی ئەترازێ
ئەبینم: بێ خشپە، لەسەر لا

چاوزیتی

قژنێ، ریشنێ

باڵاکورت

هەناسە سواربوویەک

هەروەکو مامزێ پێکرابێ و راونرابێ

بەپەلە خۆی ئەکات بەماڵدا

دوو پشکۆی بیلبیلەی

بەدەوری حەوشەدا ئەگەڕێ

ئاوڕێ.. دوو ئاوڕ

ئەوساکە بەرەو ژوور

هەنگاوی خێراتر هەڵئەگرێ

ئەگاتە بەردەمی پەنجەرەی ژوورەکەم

ئەوەستێ

بەپەنجە چەندجارێک لەسەر یەک
لێی ئەدا:
-تەق. تەق. تەق-
بەئەنقەست دووجاریش
لەسەر یەک ئەکۆکێ
"تێئەگەم خۆیەتی:
"جەمیل"ە
لەدوور را هاتووە
ماندووە: ئەزانم لەمناوە بەتایبەت لای داوە
بۆ ئەوەی سەردانی من بکا"
ئەشڵەژێم، خەریکە پەنجەرەم لێ ئەبێ بەدەرگا
سەرسمێک ئەدەم و پێخاوس رائەکەم
هەر لەبەر هەیواندا

باوەشی پیا ئەکەم

هەروەکو دوو لقی

دوو داری راست و چەپ تێک ئالاو

من سەر ئەخەمە سەر شانی راستی ئەو

ئەو سەری ئەخاتە سەر شانی راستی من

نەجارێ نەدوودجار نە دەجار

تۆ بڵێ هەزارجار

پەڵاسی ناو دەمی

ئاوێنەی تەوێڵی

گەردنی رەنگ لیمۆی ماچ ئەکەم

گوڵاڵەی برینی سەر سنگی ماچ ئەکەم

ئەو وەختەی کە دەستمان لێک بەردا

بەرامبەر یەکتری دانیشتین

لەباڵا ئاوێنەی دیواردا

تەماشای خۆم ئەکەم.. ئەبینم

سەر سنگم سوور بووە

رووخسارم سوور بووە

ژوورەکەم سوور بووە

بۆن ئەکەم

دەستوپل بۆنی گرت

بۆنی گوڵ، بۆنی خاک، بۆنی گیا

جل بۆنی باروت و قژ قەوزەی رووبارو

ژوور بۆنی گۆگردی

ئەشکەوتی ناو چیا

***

سەرەتە بێ دەنگیی خوێنێکەو ئەمگرێ

سامێکەو زمانم: ئەبەستێ..

ئەوکاتەی چنگی خوێن بەریدام..

هەڵ ئەستم:

چایەک و پەرداخی دێنم

هالاوی چایەکەو هالاوی هەناسەی

تەمێکە بۆ: کەمێ

لەڕووەمان ئەنیشێ

-جەمیل گیان لاواز بووی

لاوازی

وەک کۆترە باریکە

وەک وملی دیوانە

وەک قەڵەم

بەیەک بین ئاوەکە هەڵ ئەدا

چایەکی بەردەمی تێک ئەدا

قومێکی لێ ئەداو دەستی چەپ

ئەخاتە سەرشانم:

-لاواز بووم؟!

شاخ و داخ چاوەکەم! شاخ و داخ

شاخ خاکەو شەم دایکەو

من وەلی دیوانەو

من کۆترە باریکەی "کۆمەڵە"و

بۆ پەنجەی زارۆڵی هەژاران

من قەڵەم

پاش تۆزێ دەست ئەبا

لەپزوی شەڕواڵدا

چوکلێتە نامەیەک

دەردێنێ و ئەمداتێ

بەدەنگێ، وەک وژەی دەستان بمدوێنێ

وەک شەپۆل هاژەی دوور

بمگاتێ و بمدوێنێ

پێم ئەڵێ:

-دوێنێ شەو کە دیمن سێ قۆڵی

"شەهاب و جەعفەرو ئەنوەر" بوون

هەر سێکیان لەسەر ئەرز چوارمشقی

لەدەوری ئاگری بەکڵپەی

ماڵێکی کۆچەردا دانیشتن.

هەر لەوێ، هەر لەبەر ڕووناکی ئاگردا

بەنۆرە هەریەکەو دێڕێکی نامەکەی

بۆ کێژو و.. بۆ کوڕی

قوتابی پێشمەرگەی شاخ نووسی

***

سەعاتێ زیاترە لەچاویام

تەماشای خۆر ئەکەم.

سەعاتێ زیاترە لەدڵیام

گوێ ئەگرم لەخوێن و سەرئەنێم

بەسنگی خاکەوە

سەعاتێ زیاترە من ئەوم ئەو منە

من پرسیار

ئەو وەرام

-جەمیل گیان بێ دەنگی دەبدوێ؟

-مەنزڵم.. بڵاوە.

هەر ئەمشەوە من دەبێ پێیەکم لێرەبێ و

ئەویتر لە -بۆکان-

هەر ئەم شەو من ئەبێ

بەسواری ئەسپە رەش

دەمامک هەڵبەستوو

خۆم بکەم بە "قەلای هەولێر"داو

هەر ئەمشەو سەریش بەم

لە "مەم"ی هەژاری ناو "بۆتان"

وا "جەمیل" بەپێوە وەستاوە

بەژن سوور

هەر ئەڵێی هەناری گوڵ کردوی

گوێ ئاوە

بەژووردا چەند جارێک دێ و ئەچێ

ئێستێک و لەبەردەم دۆلابی

-"سەردەمێ دۆلابی حاجەتی موبەق و،
ئیستاکە کتێبا" -ئەوەستێ.
ئەوەتا دانەوی و لەخانەی دووەمدا
سەروخوار ورد گەڕا دەستی نەکەوت
دیوانی "بێ کەس"ی دەرهێنا
هەروەکو یەکەم جار
ملۆتکەی جگەری تاقانەی هەڵبگرێ
بەو جۆرە هەڵگرت
لەسەر خۆش چاوان و رومەتێ
دیوانی هەڵمژی و ماچی کرد
-بۆ ئەڕۆی ئەی ئاسکە سوورە
بۆ ئەڕۆی!
بۆ ئەڕۆی ئەی مانگی
کاکۆڵ ئاڵ بۆ ئەڕۆی؟!
بەم شەوە بۆ ئەڕۆی

بارانەو رەهێڵە
دەتخوا هەر ئەشرۆی
گوڵاڵەی زامێکی سەر سنگت
لەلای من جێبێڵە
-بەنگ نابێ عاشقێکی رەوەندەو
بەتەنیا لەماڵێ لانادا
بەنگ نابێ خەمێکی کێوییەو
بەتەنیا لەشاخێ نادا.
پیخاوس بەدوایدا رائەکەم
نایگەمێ.. تیشکێکەو.. نایگەمێ
-بارانەو راهێڵە
تەڕئەبێ -جەمیل- گیان

تەڕ ئەبێ!

وا ئێستە گەیشتە بەردەرگا

ئیستێک و بۆ ساتێ ڕاوەستا

ئاوڕی دایەوە، سەرێکی هەڵبڕی

مانگی سوور لەشەوی

ڕەشپۆشدا پێکەنی

ئەوساکە دەستی برد،

لەپەنا دیواردا

چەترەکەی هەڵگرتبوو

بێ خشپە، لەسەر لا

بەدرزی کراوەی دەرگادا

تێپەڕی و..

بەتەنیا جێی هێشتم!

١٩٨٣

# گۆچی زاوایەکی نامۆ

جەوهەر کرمانج ٠

کێ پێی گوتی،

بەم وەرزی سەهۆڵ بەندانە

ڕشماڵی ڕەوەندیت بەرەو

مەنزڵێکی ئەوەندە دوور بپێچیەوە

کێ پێی گوتی:

لەم چەرخە نایەکسانەدا

پشت بکەیتە ئاوەدانی و

بۆهەمیشە نەیەیتەوە

خۆتۆ وەکو هەڵۆیەکی هەواردیتە

لەسەرلوتکەی بەرزنەبا

نەدەنیشتی..

وەک کۆچەرێکی گەڕیدە

لەم کوێستانە سەربەتەمە گەورە ببووی

رەنجبەرێکی چاو قایم بوویت

چ ئاغایێ دەری کردبووی

بۆڕۆیشتی-

بۆڕۆیشتی-؟!

نەڕۆیشتبای-

ئاخرتازە منداڵەکان

زمانی ئاگر فێردەبن

٢٠

تازە خەریکن لەگورزو

تۆبزی دوژمن تێردەبن

زوو رۆیشتی

نەرۆیشتبای..

ئاخرسبەی ..

گەربەزمانێکی ڕەوان

لەگەورەکانیان بپرسن:

ئەریٚ دایە

ئەریٚ بابە

مامۆستا گەورەکانمان کوان

کوانیٚ ئەو مامۆستا جوانەی

هەمو رۆژیٚ بەخەندەوە

لەسەرەتای گوتنەوەی وانە بەوانەی

پێی دەگوتین:

منداڵینە:

مەتەڵێکتان بۆدەبێژم

ئەوەی توانی هەڵی بێنیٚ

ئەوە شایستەی چەپڵەیٚ زۆربەتینە:

ولاَتێکی گەورە هەیە

هەتا چاوبڕدەکات دەشت و

کانیاوی چاو بەگریانە

لەهەرچواردەوری سنووری

دیوارێکی ئەستوورهەیە

هەزارساڵە..

کوڵنگ وبێڵی لێ دەدرێ

نارۆخێ وهەردیوارە کۆنەی جارانە

چیای بەرز بەرزی تیایە

ڕەزی تیایە

بەلاَم ئەوەی داخی دڵی دانیشتوانە

وەتی ئەم ولاَتە هەیە

بێ ئالاَیە..

بێ فەرمانڕەواو سوڵتانە

دەی بزانم:

چ کیژە ڕەندوو ئازایێ

چ کوڕ خاسێ

ئەم وڵاتە زنجیرلەپێ یەدەناسێ..؟

-من..ماموٚستا

+من ماموٚستا

-ماموٚستا..ماستا..ماستا..

+کچم هەریار

دەی کیژی خوٚم زوٚرئاسانە

-ماموٚستا ئەوەی توٚفەرمووت

هەبێ و نەبێ کوردستانە.

گەربپرسن..

دەبێ وەڵامی ڕەوانیان بدەینەوە

پێیان بڵێین:

مەپرسن مامۆستا بۆچی..

بەجێی هێشتین

بۆکامە هەواربووکۆچی

باهەوڵدەین

سبەی تۆڵەی بکەینەوە

*      *      *

هەڵۆیەکی بەرزە فڕبوویت

لەسەرلوتکەی بەرزنەبا نەدەنیشتی

لەم کوێستانە سەربەتەمە گەورەی ببووی

ڕنجبەرێکی چاو قایم بووی

چ ئاغایێ دەری کردی

بۆڕۆیشتی..؟

نەڕۆیشتبای

تازە هەتاوگەرم دادێ و
تەم تومانی خەم ڕاودەنێ
تازە کۆرپەی حەزێ دەگرێ و
بەرەو بەهارێکی خەملیو
هەنگاو دەنێ
کوڕە زاوا- بووک ڕەبەنە
مەڕۆباشل نەبێ چاوی
دەلالی پانی بەخەنە
«هەوالێ ماینێ زاوای سوورە»
«هەوالێ..زاوا ڕێگای دوورە»
«هەوالێ..کۆچی زاوای شینە»
«دەلالێ کورمالێ خەلکینە»
«دەلالێ کورهەرقوربانینە»
هەلۆیەکی بەرز فڕبوویت

/

لەسەر لوتكەی بەرزنەبا نەدەنیشتی

ڕەنجبەرێكی چاوقایم بووی

چ ئاغایێ دەری‌كردی

بۆڕۆیشتی..؟

نەڕۆیشتبای ..

ئاخرسبەی ..

نۆبەتی ڕنینی ڕەزە

سبەینێ نۆرەی بڕینی

قۆناغێكی درێژترە،

هەرەوەزە..هەرەوەزە

توخوا مامۆستا وەرەوە

ئەمجارەیان..

وانەی مێژووی قارەمانیت

بەمنداڵە هەژارەكان بدەرەوە .

١٩٨٠/هەولێر

گۆڕەپانێکی چیمەنتۆڕێژ، زۆر ئەفەندیلۆکە هاتووچۆیان بوو، هەندێکیان پـۆزایی دەمانچـە لـەژێر چـاکەتی سـەرێکیان جووڵـەی دیـاربوو. لـەپڕ کراسـەکەمیان لەبـەر دادڕیو هەویـەو پارەکـەیان لێـدەرکردو چـاویان پێبەستمەوە.. دوو شەپی بەلەزەتیشیان پیاکێشانو ناویان پرسیم: ناوت (جـەمیل)ە؟.. بـەڵێ نـاوم جەمیلـە. وتـی ئـەوە تـۆ چـوار دینـارو نیـوت لای ئێمەیە ئەگەر بەساغی دەرچوویت دەتدەینەوە.

قەفێکیتری کەلەبچەکەی دەستمیان توندترکردو یاساوڵەکەی ئاسایش چـەند جـوێنێکی داو بردمیـە ژوورێکـی وا کـە هـەر زیـڕەی خـەڵك دەهـات لەبەرشەقو تێهەڵدان، هەروەها مێزە ئاسنینە گەورەکانیان بەسەر عەردی ژوورا دەخشـاندو قـڕە قـڕو گرمـەگرمی تـەمێکی ترسـناکی داپۆشـتبووە شوێنەکە.

یەکێ هات ناوی پرسیمو دیاربوو لەوانەبوو کەپێی سپێردرابوو لەمنو چەند کەسێکیتر بکۆڵێتەوە. وتی:

- ناوت چییە؟
- ناوم جەمیل رەنجبەرە.
- بۆگیراوی؟
- خۆتان دەزانن.
- وەرن ئەو سەگبابە بۆ ئەوێ ببەن.

بردمیانـە دەرەوە نـاو هاتوچـووی بـازاڕی ئیشـکەرانی دەزگـای ئاسـایش خـۆی بـوو.. دەسـتمیان کـردەوەو ئینجـا هـەر دەسـتێکمیان بەکەلەبچـە بەلایەکی شیشی پەنجەرەکەوە کردو بەجۆرێ بستێ مابوو پێم بگاتـە سـەر عەردەکە.

یەکەم: ئەو کوڕانە گەوادن.. فەت نابنە پیاو.

دووەم: ئێستا هەموومان دەیگێین.

سێیەم: (بەدەم تێپەڕینەوە) بەسۆندەو فەلاقەکە بهێنم ئینجا من خۆن چاری دەکەم.

منیش بێئەوی بەچاو کەس ببینم، سەرم زۆر توند بەستراوەتەوە چاوە بەستراوەکانم وەختە شەق بەرن. باڵە هەڵواسراوەکانم خوێنی تیا سەرناکەوێتو وەکو تۆقەبازنێکی دڕندە چەقیوەتە ناو زەنگەی دەستم ئەمەو لەماوەی شەوو رۆژێکا سەدەها زللەی شۆفێنییو مرۆڤ نەویستانەم پێدەکەوتو لێوە وشك بووەکانیشم بەئاستەم هەناسەی پێش مردنی لێدەردەچێتو کەبەمجۆرە لەهۆش خۆ دەچووم ئینجا جاربەجار پەنجەی رق دڵۆپەی ئاوی مانو نەمکانی دەهاویشتە سەر لێوە وشکەکانم. ئەوەی ساغ مابێت لە لەش تەنها دێنەمۆی ئاگاییم بوو دەمزانی خەریکی چینو بۆ وام لێدەکەن.. لەپڕ تەقو هۆڕی قۆندەرە هاتو کاشیە چیمەنتۆیە هەرچی بوو (عەرد) لەبەر کۆمەڵێ پێی زریکە زریك کەرا مۆزیقای مرۆڤ کوشتنیان پێك هێنابوو.. دیاربوو (سید ساعد) گەورەیەك بوو هەموو شتی بەدەست بوو وتی:

- ناوت چییە؟

- پێمنەکرا وەڵامی بدەمەوە. وتی:

- بیکەنەوە جارێ با نەمرێت. (شڵپ کەوتمە عەرد)و هەرچەند هەڵگێڕو وەرگێڕیان کردم تا درەنگ قۆڵو بازووم نەکەوتەوە کارو رایانکێشام بەخشەخش تا بەرپێی هاتوو چۆکەران چۆڵ کەم. تا دەیەم رۆژ ئەمە حاڵم بوو، لەرۆژی دەیەمدا بردمیانە ژووریو چاویان کردمەوە.

دوو ئەفسەری ئاسایش بەگوێرەی قسەکانیان دیاربوو، یەکێکیتریش کەسێیەمیان بوو، کەبە (سید المساعد) بانگ کرا کە تێگەیشتەی ئەوان بوو لەپشت مێزێکی ئاسنا دانیشتبو دەمانچەیەکی گەورەی بە رووتی بەسواری بەدەستی سوار کردبوو. دەسکە خاکەنازێك و سۆندەیەکی قێرۆپاچ و گوریسێکی نایلۆنی ئەستوور لەگۆشەیەك دانرابوو. لەنێو خۆیان جگەرەی بیانیاندەدایە یەکتری بەدەم گاڵتەوە سێیەمیان تەلەفۆنی دەکرد:

هەلاو.. بەسەری تۆ ئەگەر دەعوەتێکی زۆر گەورە نەکەیت و ئەوەی پێشم وتی نەبیت (فلان) بەر نابێت و چونکە خۆی قسەی لەسەر خۆی کردووە..! ئیە.. دەزانم خزمی ژنەکەتە.. ئەوەش دەزانم ئەوە سێزدە رۆژەکابرا گیراوە تۆش سێزدەرۆژە (بێگانی).. نا نا ئینشا الله تاتۆ ئەم نیعمەتەت لەکیس نەچێت بەری دەدەین.. بەڵام جارێ هەراسانمان لێهەڵمەگرن.. (تەلەفۆن دانرا) مساعد: بەخێر بێیت..

- اهلا.
- ناوت جمیل صالح نازناوت (رەنجبەر)ە.. ها.. وایە.
- بەڵێ.
- ئەگەر مرۆڤ کارێکی خراپ بکات پێویستە دان بەهەڵەی خۆیدا بنێت و بەتایبەتی ئەگەر کارێ بێت دژی سەلامەتی وڵات و حیزب بێت (نقە نایەت) جا مرۆڤ گرنگ ئەوە نییە هەڵە نەکات گرنگ ئەوەیە کە هەڵەی کرد ئەگەر راستی نەکردەوە پێویستی بەسزادانە.
- مەبەستتان لەکام هەڵەیە، کام راستکردنەوەیەو کام سزادان. بۆچی..
- چاك دەزانین.. (وێنەی (م)ی نیشاندام)و ئەم کوڕە دەناسیت..

- نەء نایناسم.
- چۆن ئەوە (م.ھ) یە لێپرسراوتانە لە ڕێکخراوی (ك.م.ل.ك.ھ.ھ)دا.
- نەخێر شتی وانازانم.
- نەك ھەر (م.ھ)... (م.ن)و (ن.ر)ش دانیان پیاناوە کەتۆ ئەندامێکی کۆنی ئەو ڕێکخراوەیتو بەڵکو لەدامەزرێنەرانی ساڵی حەفتاو دواتریو ئێستاش ئەندامێکی سەرکردایەتیو لێپسراوی ڕۆشنبیریت لە ھەرێما.
- نەخێر وانییە. ئێوە بۆشتم بۆ دروست دەکەن.
- ڕاوەستە.. دەگوێت لەم شریتەی (م.ھ) بگرە:
- شریتەکە: جەمیل ڕەنجبەر، کوڕێکی سوورو سپی جوانکیلەیە، مامۆستایە لە مێرگەسۆر منالێکی ھەیە ناوی (ھەرەوەن)ە زۆر قسەی خۆشە فێربوون بە ئینگلیزی قسەمان لەگەڵ دەکاتو زۆرجار ھاتوچووی مالیانم کردووەو کۆبوونەو ەم لەگەڵ کردووە. ژنەکەیشی خوێندەوارو مامۆستایە.
- باشە ئەوە وەسفی خۆی، قابیلیەتی چۆنە.
- شریتەکە(م.ھ): کوڕێکی زمان لووسو زۆرزانە زۆر قووڵ بۆتەوە لە بیری (م.ل) یەتیو خۆییو جەعفەرو عەلی لەھەولێر لەگەڵ کاکە حەمە لەدوای ساڵی ١٩٧٠ دەستیان بەدروستکردنی ڕێکخستنو تێگەیاندنی خەڵك کردووە، بەتایبەتی جەمیل ڕەنجبەر سومعەیەکی سیاسیو ئەدەبی گەورەی ھەیە لەناو ھەموو خەڵکەکەو بەتایبەت لەلایەن سەرکردایەتی جولانەوەکە.
- باشەلەڕێکخستن چیدەکرد لەگەڵتانا؟
- م.ھ لەم دواییە زۆر لە کادرە (م.ل)ەکانی ڕێکخراوەکە خۆیان کێشایەوە بۆ ئەوەی بۆ دوارۆژ بەکەڵك بێن بەتایبەتی ئەوانەی لە ڕێکخستنا

خاوەن تاقیمانەو بڕواقایمو قاڵبوون، جایەکێ لەوانە جەمیل ڕەنجبەرە دەیەوێت هەندێ خۆی بکێشێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشا لێپرسراوی فعلی لیژنەی ڕۆشنبیرییە لە هەرێمی ئێمەداو نیاز وابوو ببێتە ئەندامی ڕۆشنبیریی سەرکرایەتی گشتی.

- باشە لیژنەی ڕۆشنبیری کێی لەگەڵ بوو؟

- (م.ھ) پێك هاتبوو لەسەرەتاوە لە (ع.ص)و (ن.ر)و (م.ھ) خۆم لەسەرویانەوە جەمیل ڕەنجبەر، ئەوەبوو زۆر لێکۆڵینەوەمان نووسیەوە چونکە جەمیل دەستی ئەدەبی بەهێزە هەمووی هەر ئەو بڵاوکراوەکانی دەنوسییەوە.

- باشە ڕێکخستنی تری نییە؟

- م.ھ: هەندێ کەسی لایە بەڵام ناوەکانی نازانین، چونکە لەم دواییە نهێنی خۆی لێمان دەشارێتەوە. هەتا نازانین باری جوڵانەوەکانی لەچدایە، وەك وابێ دان بەئێمەدا نەنێت کە هەرێمین و نیازی ڕەنگە (تکتل) یش هەبێت.

- لێرەدا تەسجیلەکەیان کوژاندەوەو کابرا وتی:

- خۆ تێگەیشتی و چاك گوێت لێبوو.

- بەڵام هیچی وانییە.

- دەتۆ بڕۆ دیوی تری ژوورەکەو لەکونی کلیلەکەوە سەیرکە ئێستا (م.ھ) دەهێنین چۆن باست دەکات (هێنایان، بێئەوەی بزانێت من گوێم گرتووە).

- (م.ھ): سڵاو...

- دانیشتوانی ئاسایش: سڵاو کاك مەولود، تەندروستیت چۆن بوو. دانیشه. ئێی.. ئەوە بەریشت دەدەین و ناردوومانە کتێبەکانیشت لەماڵ بۆ بێت، خۆ بیجامەو شتەکانت پێگەیشت؟

- م.ه: بەڵێ.. زۆر سوپاستان دەکەم.. وامدەزانی ئاسایش وەکو فاشی دەجولێنەوە، بەڵام لەگەڵ منا وانین.

- باشە. ئەوە جەمیل دەڵێ قسەکانی مەولود وانییەو ناشی ناسم.

- (م.ه): لەگۆڕەپانی دادگای هەولێر بەهۆی (ع.ص) یەکترمان ناسی و هەر لەوێش بڕیاری دروستکردنی لیژنەی رۆشنبیریمان دا.. ئەوەبوو (ع) رایکردو تەنها ئێمە ماینەوە. جەمیل زۆر رەق و توند بوو لەگەڵ ئەوانەی خاوو خلیسك بوون بۆ نموونە لەم دواییەدا بڕوای وابوو (ن.ر) دەرکەینو دەیوت بەکەڵکی کاری شۆڕشگێڕانە نایەت. ئەگەر بەقسەی منیش بڕواناکەن ئەوە لە (ن.ر)و (م. زەنگەنە) بپرسن.

- دەتوانی بەرەو رویان ببیت..!

- ناوەڵڵا ناخۆشە. (بردیانە دەرەوە.)

کابرایەکی دان پیانەر کەخزمەتی یاساوڵ بکات و هەموو شتێکیان پێبڵێت هەڵبەت لەگەڵی نەرم دەبن تا قسەکانی لێوەردەگرن و تا تەمایان پێی هەیە.

ئەفسەرە یاساوڵەکە وتی:

- ها ئێستا خۆیشت دیتت بڕوات نەکرد.

- نەخێر نایناسم و هەرچی دەڵێت درۆیە.

- باشە ئەگەر (ئیفادەی (ن.ر)ت بۆ بخوێنینەوەو وای تیا هەبوو چیدەڵێیت؟

ئیفادەی (ن.ر): (زۆر جار هاتوچۆی ماڵی جەمیل رەنجبەر)م کردووە بەتایبەتی لەبەر زۆر ئیش و خوێندنەوەو باسکردن کە هەر لەماڵیان دەماینەوە، جارێ لەجاران دۆڵمەشتمان خواردوەو لەگەڵ کچەکەی بە ئینگلیزی قسەمان کردووەو (هەرەوەن) گۆرانی بۆ وتووین جاربەجار ژنەکەیشی لەگەڵمان دادەنیشت بەڵام بۆ کۆبوونەوە نەبوو. یەکێ لەجارەکان باسی قۆناغی دەرەبەگیمان کردو باسی ئەوەی کرد کە ئایین کۆڵەگەی یاسای ئەم قۆناغەیەو زۆر هێرشی بردە سەر.. هەوڵی دەدا منی پێ ئیقناع بکات و لەم دوا دواییەش منی بەدڵ نەبوو. دووریان خستمەوە لە لیژنەی رۆشنبیریی..)

ئەم ئیفادەیە ئەوەندەی کە باسی منی تێدابوو بەم جۆرە خوێندرایەوە. ئینجا هەر وتم وانییە.

بردمیان بەستمیانەوەو روتیان کردمەوە. جار ناجاریش لەژێرپێیان دەدام تا شل و کوت دەبووم.. لەنێوان دوو کەس بەچاوبەستراوەیی بەڵام دەنگەکانیانم دەناسییەوە یەکەمیان عوسمان گرو دووەمیان (ن.ر) دەم بیست کە عوسمان دەیگوت: دایکتان دەگێم تۆڵەتان هەر لێدەکەمەوە، خۆ رۆژمان هەر لێدادێت )پتر لێیان دەدا).

دەمبیست (ن.ر) دەیوت بژی حیزبی بەعسی عەرەبی، بەخوای هیچ نەکردووە، هەرچی هەش بوو خۆم پێم وتن.. بەخوا هێشتا ئاسایش (امن) قەرزارمە زۆرم بۆ وتووە.. (هەر لێیان دەدا..) بابە لەمەودوا لە حەوشی ئاسایش خێوەتێ هەڵدەدەمو تابڕوام پێبکەن کە (ن.ر) هەقی لەهیچ ئەملاو ئەولا نییە).

منیش لەداخی هەردوو قسەکانی عوسمان و (ن.ر) چەند داهێزرابووم یەکجار دڵم دەگوشراو خۆم پێ نەگیرا... وتم:

عوسە.. ئەوقسانە زیادن، پترت لێدەدەن.

کوڕ نورە گو.. (مەبەستم ن.ر) ئەم میچکە میچکەو مەراییە چییە ملی زۆر کەست شکاندوەو دەشتەوێ رزگارت بێت شەرم لەخۆت بکە ئێستا ببیە ئەوانیش بڕوات هەر پێناکەن.. یاساولی ئاسایشەکان.. دایان گرتم بەشەقۆ تێهەڵدان وتیان: ئەوە قسەیان فێر دەکەیت.. سەگی سەگباب چ کارت بە ناو کرێکاری پیس و چەپەڵەوە هەیە تۆی مامۆستاو باوەشێ دینار وەردەگریت.. چۆن بێزت هات تۆی ئەفەندی تێکەڵی رێکخستنی کرێکاران ببیت! دەعافیەتت بێت.. دەبیخۆ.

لێرەووە هەموو شتێ ناڵێم کە لەگەڵیان کردمو چیان پێ دەوتم تەنیا ئەوەندە دەڵێم مردنم سەدقات لاخۆشتربوو.

تابەیانی ئێوارەکەی هاتمەوە سەرخۆ بەهەمان شێوە تایبەتیکە بردمیانەوە ژوورێ مساعدو ئەفسەرانی ئاسایش وتیان: ها چیت وت. دان پیانانێیت.. دەنا دەتکوژین.

– دان بەچیدا نێم خۆ هیچی وانییە، جارێ هەرچی رێکخستنە هەر لەمن دوورە. بەڵام ئەوەی بەڵا بێت بەسەرمەوە ئارەزووە ئەدەبییەکەیەو وەك ئەدیبێك دەورێکی بیرگۆڕشینەوەی زۆرم بینیوە لەگەڵ ئەوانەی بیانناسم یا نەیان ناسم، چونکە زانیومە کە ماوەی دیموکراتییەت و جیاوازی راو هەڵگری بیر هەیە لەدەوڵەتێکی وەك عێراقدا بۆیە رەنگە زۆر قسە لەوانەیە رێی بچێتی بەڵام چۆن.

جارێ با چەند شتێکتان پێبڵێم:

١. (ع.ص) كاتی خۆی برادەرێکی کۆنە پارتیم بووە. زۆر جار پیاسەشمان بەیەکەوە کردووەو چاکیش دەیناسم. بەڵام ماوەی زۆرە نەمدیوە.

٢. هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ (ج.ع)و کاکە حەمەو ئەوانیتر کەناویان دەڵێین نییە، تەنها پێش شەڕی ئاش بەتاڵەکە ئەوان لەکۆڕە ئەدەبییەکانا زۆر مناقەشەیان دەکردو بەم جۆرە (مەرحەبا)ی پەیدا کرد.

٣. (م.هـ) ڕەنگە ئەو من بناسێتو ئەم دەموچاوە لەبەر ئارەزووە ئەدەبییەکەم ڕەنگە بەیەکەوەش دانیشتبینو وتووێژی ئەدەبیمان کردبێتو خۆشتان دەزانن ئەدەب زۆر جار دەبێتە مەسەلەیەکی سیاسیش.

٤. (ن.ر) ڕاستە لەمناڵییەوە بەیەکەوە قوتابی بووین و تا ئێستاش برادەرێتیمان هەرهەبووە پیاسەشمان بەیەکەوە کردووە، ڕەنگە خۆیشی حەزی لەئەدەبە، دەڵێی بپرسن ئەگەر بەڕێکەوت نەبووبێ کەی ئێمە بەتایبەت دانیشتووین؟

٥. (م. زەنگەنە) لەکوێو من لەکوێ؟! دەوەڵڵا بڕواناکەم دیتبم. (دەبێت شتێکتان پێبڵێم من توانا ئەدەبییەکەم وایکردووە لەزۆر مەجالا دەربکەوم، خەڵك زۆر دەمناسن. ڕەنگە زۆرکەسیش لەلای خۆیەوە بەراوردی کردبێت، کە من کۆنەپەرست نییمو جۆرئەتشکێنمو جورئەتیشم هەیە لەقسە کردن بڕواشم بە (م.ل) ێتی هەیە.. بەلای کاك (م.هـ)و (م.ز)و (ن.ر)و هەتا خەڵکی تریش. هەتا ئێوەش لاتان وایە من شتێك هەر هەمەو دەبێو دەبێ لە ڕێکخستنێك بم.. نە.. خۆتاوان نییە خەڵك بێ لایەن بێتو لەهیچ ڕێکخستن نەبێت ئەی گەر وانەبێت دیموکراتییەت لەکوێیە؟!

لەلایـەکی تـریش رەنگـە ئـەم دانپیانەرانـە خۆیـان شـتێك بـووبنو مـن نەمزانیبێتو هەوڵیان دابێت برادەتریێتیم لەگەڵ دروست بکەن. یان بەهێزی بکـەن بەڵکـە رێکـم دەخـەن، چـونکە سیاسـەتی کـادرانی رێکخسـتن شـێوەی چوونە ناو خەڵکیان زۆرە.

مساعد وتی: ئەی پەیوەندین بەم ناوە چییە؟ (هوشمەندو.ح .ك .ن عزیز. و ارسـلان. ج.تاڵـەبانی. عـەلیکۆ. ن. عومـەر. م، س. نەوشـیر وتم: هوشمەنـد بەر لە ساڵانی ١٩٧٠ لە ئاهەنگا بینومە گۆرانی وتوە رەنگـە مـن نەیانناسـمو هـەر ئەوەنـدەو بـەس (ح.ك) کۆنـە بـرادەری یـەکێتی قوتابیـان بـووین بـەر لـە سـاڵی ١٩٧٠و ل سـاڵی ١٩٧٤ لەبەرئـەوەی جێگـەی ژیـان نـاخۆش بـوو لەچۆمان لەبەرئەوەی هەر منی ناسیوە چەند جارێك لەلامان ماوەتەوە.

مساعد : لەگەڵ کێی تریش ئەژیایت؟

وتم: تەنها برادەرایەتیمان لەگەڵ ئەرسەلان هەبوو بەس بۆماوەیەکی کەم.

مساعد: چیتا دەوت؟

وتم: کـەس نەیـدەتوانی ئـەم واقیعـە تاڵـە بشـارێتەوە کـە جوڵانەوەکـە پەیوەنـدی بـەئیمپریالیزم هـەبوو.. چـاكو سـەربازی ئێـرانو ئەمـەریکی بەئاشـکرا هەسـت پێـدەکرا. رەنگـە باسـی ئەممەسـەلە سیاسـییە پرمـە ترسـییەشمان کردبێـت وەك نـانو ئـاو خـواردن، نـەك وەکـو رێکخسـتن. خـۆ ئەگەر وەك رێکخستنیش بێت بڕیاری سەرکرایەتی شۆڕش هەرچی لە پێش ١٩٧٥ کرابێت بوردراون، بۆیە لەوە ناترسم، بەڵام ئەو راستییەش هەر دەڵێم ئەوساتیش پەیوەندیمان پەیوەندی رێکخستن نەبووە.مساعد: ئەی دوایە.

وتم: دوایەحمید تەسلیمی حکومەت بۆوەو پەوەیندیشم لەگەڵ ئەرسەلان نـەماو لەگـەڵ ماڵـەوە چـووینە ئۆردوگاکـانی ئێـران وەك مامۆسـتایەکی

کەمدەست چاوەڕێی کاتمان دەکرد ئەو ناوانەی تریش ناوت هێنان هیچ پەیوەندیەکم پێیانەوە نییەو ناشیان ناسم. تەنها (ج. ت) ناویم بیستووە.

مساعد: ئێ، تۆ ئەگەر بیروڕات (م.ل) بێت بۆ شیوعی نەبوویت؟

– :توانای رێکخستنم نییەو نەبووە.

مساعد: تۆ (م.ل) بیتو کۆمۆنیست نەبیت لەگەڵ جەماعەتی جەلال تاڵەبانی نەبیت کە (ك.م.ل)ین دەبێ رێکخستێکی تربیت.

وتم: نەخێر.

:بۆ نەبوویتە حیزبی بەعس.

وتم:حیزبێکی عەرەبییەو منیش کوردم.

: زۆر کورد بووینە بەعس.. تۆ لەوان پتری.

وتم: درۆم پێ لەگەڵ خۆم ناکرێت.

دوای ئەوەی گەیشتنە ئەم ئەنجامە کەمن بڕوام بە (م.ل) هەیەو دیارە لە ئەنجامی ئەم بڕوایەم ویستوومە یەکێتی بکرێت لەنێوان (م.ل)ەکان. وەك جەماعەتی (م.ە) وهەستیشم بەرێکخستن کردووە وەك تەرەفێکی سیاسی پیانم زانیوەو خەبەری میریشم نەداوە، ئەم حەز بەوانە کردنەم بە مەیل و پەیوەندی دەژمێردرێت.

دوو شەو لەسەر یەك تا درەنگ بانگیان دەکردمو پرسیاریان لێدەکرد، لەهەموو روویەکەوە وەکو:

١. بیروڕام بەرامبەر حیزبەکانی ناوخۆ.

٢. حیزبی بەعس و بیروڕاکانی.

٣. بەرامبەر (ئینتخابات)ی میرو ئەنجومەتی یاسادان و کارو راپەڕاندن بەناو ئۆتۆنۆمی.

٤. پرسیار لەبارەی کۆمەڵی کەسانی کوردی عێراق.

٥. پرسـیار لـەبارەی بـاری وڵاتـانو نـاکۆکی وڵاتـە سۆشیالیسـتەکان چینو روسیا.

٦. لەبارەی مەسەلەی فەلەستین.

٧. ئەوانەی دژی بەعسن کێن.

٨. خەلفیەی سیاسی واتە رابوردوی سیاسیم چیبووە.

٩. بـیروڕام بەرامبـەر (م.ه) کـە ئیعـت\راف لەسـەرم کـردوو، پـێش هەموویان.

١٠. بەم دوایە بۆ نەبوویمە هیچ حیزبو رێکخستن.

١١. ئەو مامۆستایانەی برادەرتن کێن.

١٢. براکانت ناویان چییەو کاریان چییە.

١٣. یەککگرتنی عەرەب.

١٤. حکومەت چی بکات خەڵك دوژمنایەتی ناکات.

کۆمەڵێ پرسیاری تر لەبارەی (م.ل)و ئایینو بیروڕاکانی حیزبی بەعسو شێوەی رەفتاریان لەگەڵمانا.

****

چەند رۆژێکی پێنەچوو هەڵبەت تا ٢٧ رۆژ بەم جۆرە لە ئاسایشی باکور ل هـەولێر بـەم جـۆرە روداوانـە کـە هـەرە کورتەکانییەتی ئینجا ئێمـە لەگـەڵ هەشـت نـۆ دە کـەس کـە هەنـدێکیانم دەناسـی بەیەکـەوە برمانیانـە دادگـای تایبـەتی سـەربازی کـەرکوك. لـەوێش ٢٢ بیسـتو دوو رۆژ ماینـەوەو دراینـە دادگا.

بەفەقەری (بڕگەی): ادانة المتهم جميل صالح عزيز. مدير مدرسة ميرگە سوور لميلە أو تعاونە الي اية منظمة او جبهة تخريبية معادية لنظام الحكم.. حكمت عليهة المحكمة خمس سنوات وشهر استنادا الي مادة ٢٠٤ من قانون العقوبات في الجمهورية العراقية) وەك بیرم مابێت بەم جۆرەی سەرەوە حکوم دراین و دوای چەند ڕۆژێك نێردراینە بەندینخانەی (ثقيلة) لە (ابوغريب) دوای چەند مانگێك زۆربەی حوکمە کەمەکانیان ناردە بەندینخانەی (خفيفە) لە (ابو غريب) واتە حوکمەکانمان خەفیفە لە ١٩٧٨/١٠/٣٠ لە خەفیفە نزیکەی بیست کەسێکمانیان بردە (موقف العام) لەوێ ماینەوە تا ڕۆژی ١٩٧٩/٨/١٦ واتە ئەم بڕیارەی کە پێی دەرچووین.

لەڕۆژی ١٤ی ٥ نیسانی ١٩٧٧ گیرام

ڕۆژی ١٩٧٧/٧/٣٠ لە دادگا دراین.

لە ڕۆژی ١٩٧٩/٨/١٩ بەرەلاکراین.

واتە ٤٨ ڕۆژ لەژێر لێکۆڵینەوە بووین و ٢ ساڵ و سێ مانگ و چوار ڕۆژ لە بەندینخانە ماینەوە.

یادگاری ڕۆژانی لێکۆڵینەوە لە دەزگای تایبەتی بۆ دادگای سەربازی کەرکوك:

## پێویستە حەقەکانمان بەشێوەیەکی گونجاو پێ ببەخشرێت

زۆربەی ئەو کۆڕو سیمینارانەی لەشوێنە جیاجیاکادا دەبەخشرێ یان ئەو وتارانەن لە رۆژنامەو گۆڤارەکان تایبەت بە ژنان دەنوسرێت، مافی ژنان بەشێوەیەك دەئاخنە نێو تەرازووی تاووتوێکردنەوەو مەیدانی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا داوای نەهێشتنی جیاوازییەکان و خولقاندنی یەکسانی لەنێو هەردوو رەگەز دەخوازن داوای سەربەستی تەویان بۆ دادەڕێژن بۆ نواندنی دەورێك لەکۆمەڵگا بەبێ سڵکردن و بەوپەڕی شانازییەوە، بێگومان ئەمە سەرەتایەکی باشە ناتوانێن نکۆڵی لێوە بکەین.. لێرەوە پرسیارێك خۆی دەخزێنێتە نێو باسەکەمان ئەویش ئایا تاچ رادەیەك ئەم بانگێشە داڕێژگەیەکی تۆکمەی وەرگرتووە لەڕوانگەی پەیڕەوو جێبەجێکردنەوە؟! بۆ وەڵامدانەوە هەرگیز ناتوانرێت چاوپۆشی لەوە بکرێت کە تاوەکو ئێستا یان بەشێوەیەکی درێژەی ئەم جاڕدان و بانگێشە کالآیکی رەوایانەو پڕ بەپێستی خۆی بۆی نەبڕیوە،ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەلەبەرە گەورەیەی کە ئێستا بەبیروڕای نوێخوازییەوە پڕنەکراوەتەوەو کۆمەڵگامانی خستۆتە دوڕیانی بیرکردنەوەیەکی شێواو، تەنانەت لەلوتکەی ئەم بیرە ئاڵۆزکاوە رێزو بەهایەك بۆ ئەنجامەکەی دەخەملێنن.. بۆنموونە فەرزکردنی هەندێك مەرجی بێ نمودە لەڕووی قانوونییەوە وەك حسێبکردنی دوشاهێدی ژن بەرامبەر بەیەك شاهێدی پیاو، یان حەلآڵکردنی چوار ژن بۆ پیاو بەسەر ژن، یان گەلێك بەڵگەو فەرقی هاوشێوەو نموونەی تر لە قەدرو حورمەتی ژن دادەبەزێنێ و مافی شەرعی خۆی پێنابەخشێ...

زۆر دەمێکە ئەم هەڵوێستە کۆنەپەرستی و نەرجسیەتە لەلایەن پیاو لەمێشك وچ دەروونم چڕ بۆتەوە بەهێڵێکی پان و بەرینن وێنەیەکی تراژیدیان

چەسپاند. بۆیە پێویستە لەسەر ئێمە بەرامبەر ئەمکارانەهەڵوێستێکی دیفاعی وەربگرین بۆ سەرکوتکردن و رەتکردنەوی ئەم جۆرە حوکمە قۆرغکاریەو هەرگیز ناتوانم دیمەنی ئەم ژن و مێردە لەیادکەم. بەرواڵەت بەئادگارە بن گەردەکەیەوە بەتەمەنی کچی دەشیا و بەشێوەیەکی ناچاری بەبێ دەسەلاتییەوە گوێی بۆ کلۆ کردبوو، پیاوەکەش وەکو ئەهریمەنێکی خۆشەویست، ئامۆژگارییە شەقەت و نابەجێیەکانی لە مێشکی شین دەکردو پێی دەگوت نابی بچیتە دەرەوە نابێ خۆت جوانکەی و ئەگینا وات لێدەکەم پەنجەی پەشیمانی بگەزیت.. ئەویش بەکلۆلی و بێدەسەلاتییەوە بەلێنی جێبەجێکردنی پێدەبەخشی...

بائەو مامۆستا شکۆمەندانەی یان ئەو ئوستازەی کاتێك دێتە سەر باسی ژن بەفیزو بێزەوە باسی لێوە دەکەن گاڵتە بەداوا رەواکانیان دەکات بەهیچ جۆرێك رێزو شیاوی خۆی پێنابەخشێ. وتەکانی ئەم ئوستازە بەرێزەی لەکۆلێژەکەمان لەگوێم دەزرنگێتەوەو بەو پەڕی سەربەزییەوە بەمیهرەبانیی ژن بەناوو ناتۆرەی ناشیاوی دەشێوێنن و وەکو ئامێرێکی شەهوەت بازی دەخاتە بەرچاومان بۆ دامرکاندنەوەی حەزە لەبن نەهاتووەکانیان. یان وتەکانی ئەم نوسەرەو شاعیرانەی کاتێك بەقەدو شەنگ و سالاری ژن هەڵدەڵێن وە لەزۆر روووەوە لاف یەکسانی بۆ جاڕدەدات، بەلام کاتێك بێتە سەر ئاستێکی واقیعی هەرگیز ناتوانێ هەڵوێستی بنەرەتی خۆی حەشار بدات، وتەکان و نووسینەوکانی بەجۆرێ کردەکی پەیرەو بکات بیخاتە نێو چوارچێوەیەکی جێبەجێکردنەوە ئەمانە گشتیان ئەم جۆرە ئازارو مەینەتییە رەنگدانەوەی ئاوێتەی ئەم ژینگەوارەی لێی دەژین.. بێگومان لەزۆر روووە رۆشنبیران و مامۆستایان و ئەو پسپۆرانەی پەی بۆ

حەقیقـەتێکی زینـدو نابـەت و جڵـەوی دروسـتبوونی ئاکـامێکی ئیجـابی و گونجا و بۆ گەیشتن بەتەواوی مافە دەستنیشان کراوەکان شلکردۆتەوە و لەکەلاوپۆژنەیەکی بچوکەوە تێدەڕوانێ و بەتروسکایی برێکی شەل دەبینێکی ئەمانە ئەوسنوورەی بۆی دانراوە وێکی دەهێنێ.. بەداخەوە دەبوایە ئەم گۆڕانکارییانـە ڕەوتـی پێشـکەوتن هـەر هـیچ نـەبێ نـەختێك لەتـەپوتۆزە نیشـتووەکانی پـیرە کۆنینـەکانمان.. بەهـەرحاڵ ژنانمـان لـەم کۆمەڵگایـەدا لەقۆناغێکی بەرهەڵستی دایە بۆیە بواری ئەوە نییە ژنی لێهاتوو هەڵکەوێ لـەدایك بێـت بۆیـە گەرەکـە پـێش هـەموو هـەنگاو هـەڵنانێك پردێـك لـەنێوان کـۆن و نـوێ دروسـتبکرێت و ڕێـز لـەداب و نـەریتی باووباپیرانمـان بگیرێـت و لەهەمان ساتەوەختیشدا لەگەڵ سوڕی گۆڕانە ئەوپێشکەوتنە وەرچەرخێت و هەنگاو بهاوێت.

ئەو زانا وێژەوانانە دەربارەی هۆنراوەدا ئەڵێن:

١. (ئەرستۆ): ئەڵێ: هۆنراوە بریتییە لە نواندنی سروشت یاخود کارەساتی ژیان بەرەنگی ئەمەی کە هەریە وردوی داو پیشانی یدا، هەروەها ئەوەی پێویستیشە بێ یارەنگ بێ ببێ دەربخا.

٢. (سامۆنیش): ئەیوت: (وێنە هۆنراوەیە بێدەنگە، هۆنراوەش وێنەیەکی دەنگدانە) ئەمواتایە لەهۆنراوەی پێناسیندا راستە.

٣. (تۆلستۆی) وتوویەتی: بوێژ بەرهەمی ئاوازەێیک پێک دێنی بۆ ئەوەی بیدابە گوێی ئەمو ئەودا تووشی ئەو هەستی دەروونییەی خۆی بکا کە وا دەری ئەبڕێ.

**ئاینەکانی وێژە** (مذاهب الادب)

ئاینەکانی وێژە زۆرن، بەڵام دوانیان لەهەموویان گرتگترن.

١- کلاسیکی ٢- روماتیکی.

ئەو دوو ئاینە هەموو دەم لەشەڕو شۆڕن، ئاینی (کلاسیکی) توانی هۆنراوەی لاساییکردنەوە بگەڕێنێتەوە ئەو پەڕی سەرکەوتن، کەچی هۆنراوەی گۆرانی لای کلاسیکییەکان نەگەیشتە ئەو پەردە، بەڵام ئاینی رۆمانتیکی هۆنراونەی گۆران گەیاندە پلەیەکی بەرز، وە هۆنراوەی داستان نەلەلای کلاسیکییەکانەوە سەری گرت نەلەلای رۆمانتیکەکانو نەئاینە تازەکان.

<u>هۆنراوەی داستان:</u> (شعر الملامح) ئەو هۆنراوەیە کە دەنگوباسی شەڕو شۆڕی پاڵەوانیی پاڵەوانان بەشێوەیەکی سادەو سووکو رەوان ئەگێڕێتەوە، هەر لەسەرتای مرۆژایەتییەوە هۆنراوەی داستان گەشەی کردووە (الیاذة و اودیة) دوو هۆنراوەی داستان (هومیرۆ)ی نەمر، بۆێژی یۆنان دایناوە. لە هەردووکیاندا هۆنراوەی ئاوازی تێدایە، سادەییەکی چاوپۆشیمان دەکات، جوانییەکەشی داڵمان گەش ئەکات.

<u>هونەری وێنەی لاساییکردننەوە</u> (فن الادب التمثیل) ئەم هونەرە لای یۆنانییەکانی کۆن بەهۆنراوە بۆلاسایی کردنەوە، لای ئەوان وابوو:

١. گفتوگۆ (بەهۆنراوە).

٢. گۆرانی (بەهۆنراوە).

٣. هەڵپەڕینو ئەما (بۆهنراوە)

٤. سازو ئاواز.

لەسەردەمی راپەرینی ئەوروپا (النهضة الادبية) سەدەی پانزەهەمی پاش زایین و وتراون و بویژەکانی ئەوروپا بەشوێن ویژەی یۆنانی کۆنەوە ئەرۆیشتن. بەڵکو بابەتی چیرۆکی لاساییەکردنەوەکانیان لەوەوە وەرئەگرت لەپێشدا گفتوگۆو گۆرانیان لەچیرۆکەکان کۆئەکردەوە. بەلام کەکلاسیکی دامەزرا هونەری لاساییکردنەوە کەبەندبوو بەگفتوگۆو لەگۆرانی جویَ بۆوە، لەدواییدا چیرۆکی لاساییکردنەوە جویَ بۆوە لە لاساییکردنەوەی گۆرانی.

لەسەردەمی تازەدا کەم ویژەوان چیرۆمی لاساییکردنەوە بەهۆنراوە دائەنێن..

<u>هۆنراوەی گۆرانی</u>: هۆنراوەی گۆرانی بریتییە لەهۆنراوەی (جامد . قصائد)وە یا پارچەکانی (مقطوعات) لای رۆژئاواییەکان هەر لەکۆنەوە بووەتە جۆر جۆر. هەر جۆرێك مۆسیقایێکی تایبەتی خۆی هەبووە. لەناوخۆیدا بابەت و خۆیەتی کۆکردۆتەوە، کەچی هۆنراوەی کوردی، زیاتر خۆیەتی دەرئەکەویَ، هۆنراوەی گۆرانی لەرۆژهەلات و رۆژئاوا گۆرانی هات بەسەر هۆنراوە لای یۆنانییەکانی کۆن واتەی هۆنراوە دروستکردنی و داهێنانی ئەگرێتەوە.

**وێژە ( ادب )**

هەر نووسنێك وەیا هەر وتەیەك بەهۆی شێوەی دارشتنەکەیەوە دڵو دەروونمان دەبزوێنێت یاخود هەستمان پێ بکات بەجوانی ئەوە وێژەی پێی دەڵێن ئاگادارمان ئەکا لەرابردووی ئادەمیزاد وەهەروەها وێژە ئەو شتانە ئەگرێتەوە: (دەستکردی نەخش و نیگاری سەر بەردەکان، ئاوێنەی باوەڕی نووسەرو بوێژەکانە پەردەی ناسکی ئەندێشەی بوێژەکان، ئەو هونەرە جوانانە کە پاڵەوانەکانی ئەو مەیدانانەن، نواندوویانە وەپیشە گشتییەکانی پیشەسازی و دۆزینەوەو داهێنانی دۆزەرەوەو داهێنانەکان ئەمانە هەمووی وێژە ئەگرێتەوە).

**جۆرەکانی هۆنراوە (هەڵبەست):**

هەر لەسەرەتای یۆنانییەکانەوە سێ جۆر هونەری هۆنراوەی گەورە داهاتووە.

١. هۆنراوەی داستان.

٢. هۆنراوەی لاساییکردنەوە( تمثیل).

٣. هۆنراوی گۆرانی (شعر الغنائي).

هۆنراوەی داستان: لەناو چووە، هۆنراوەی لاساییکردنەوەش لاسایکردنەوەی پەخشان جێگای گرتۆتەوە، بەڵام گۆرانی بەزیندوویی ماوەتەوە.

## پێرست

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|